# ڕەهەندەکانی
# ریفۆرمی ئاینی لە ئەوروپا

## ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی

سامان حوسێن ئەحمەد



ئەم کارە پێشکەشە بە:

- جەلال ئەنوەری هاوڕێم.
- تەواوی ئەندامانی خانەوادەکەم( دایکم، باوکم، خوشک و براکانم)

# ناوەرۆك

**پێشەکی:**

بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی دیاردەیەکی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، سیاسیی، فیکری، ئایینی ئێجگار گرنگ و فرە رەهەندی مێژووی ئەوروپایە، کە سەرەتای سەدەی شازدە ناوچەکانی جیهانی کاتۆلیکی ئەوروپای گرتەوە و پتر لە سەدەیەك بوو بە رەنگرێژکەری تەواوی رووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەو ناوچەیە و ئەنجامەکانی لە رۆژگاری خۆی و قۆناغەکانی دواتریشدا بە ئەندازەیەکی لەبرنەهاتوو کاریگەربوون لە رەوتی گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکاندا.

رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە ئەگەرچی توندوتیژی و نەهامەتییەکی کۆمەڵایەتی کەم وێنەی خستەوە، بەڵام هاوکات ئەم بزووتنەوەیە بووە لەئەستۆگری هەستیارترین ئەرکی مێژوویی لە قۆناغەکانی رەوتی گەشەسەندنی کۆمەڵگای ئەوروپا، بە بەرپاکردنی ئەو هێرشە بەرفراوان و کوشندەیە بۆ سەر کڵێسای کاتۆلیکی وەك بەربەستێکی گەورەی بەرەوپێشچوونە کۆمەڵایەتییەکان کە لەو رۆژگارەدا لە توانای هیچ هێزێکی کۆمەڵایەتی و مێژووییدا نەبوو ئەم لایەنە هەستیارە بوروژێنێت، سەرەنجام بە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە کڵێسا هەنگاوەکانی بەرەو تەریککەوتن لەژیانی کۆمەڵگای مەدەنی دەستپێکرد و زەمینەی خۆسەپاندنی عەقڵ بەسەر تەواوی کایەکانی ژیانی مرۆڤدا دەرکەوت و رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بوون بە رێخۆشکەرێکی گەورەی شکۆفاکردنی شێوازی نوێی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و فیکری و بارتەقای بزووتنەوەی رێنێسانس کاریگەر بوون لەسەر رەوتی گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکان و گواستنەوەی کۆمەڵگا لە سەدە نێوەنجییەکانەوە بەرەو سەدە نوێیەکان.

**هەڵبژاردنی ئەم بابەتە:** (کاریگەری و ئەنجامەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی لە ئەوروپا) لەو روانگەیەوە دێت کە تا ئەمڕۆش وەك پێویست خوێنەری کورد لەم دیاردە گرنگ و پڕ بایەخەی مێژووی شارستانییەتی ئەوروپا بەئاگا نین و کتێبخانەی کوردی نەك هەر لەبارەی ریفۆرمی ئایینییەوە، بگرە تەواوی مێژووی ئەوروپاوە بە رادەیەکی زۆر هەژار و دەستکورتە، بەدەر لەچەند هەوڵێك کە بەشی زۆریان وەرگێڕانن شتێکی ئەوتۆ لە بەردەستدا نییە، کە

شایستەی بایەخ و گرنگی ئەم بابەتە بێت، ئەمە وێڕای ئەوەی کە تـا ئێـستا لـە کوردسـتاندا لێکۆلینەوەیەکی ئەکادیمییانە دەربارەی مێژووی ئەوروپا بەگشتی و ریفۆرمی ئایینی بەتایبەتی ئەنجامنەدراوە، تەنها ئەوە نەبێت کە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارانە لە نێوان ریفۆرمی ئایینی مەسیحی و ریفۆرمی فیکری لەئیسلامدا بە ناونیشانی (الأصلاح الـديني في المسيحية مقارنـة بالأصلاح الفكري في الأسـلام) لە دووتـوێی ماسـتەر نامەیەکـدا لەلایـەن (کابـان عبـدالکریم علی)ەوە پێشکەش بە کۆلیجی شەریعە و خوێندنی ئیسلامی زانکۆی سەلاحەددین کـراوە کـە ئەمیش جگە لەوەی بەزمانی عەرەبی نووسراوە، هاوکات بەپێی پـسپۆرییەکی خـۆی پـتر لـە روانگەیەکی ئـایینی و تیۆلۆجییـەوە ئـەم باسـەی تـاوتوێکردووە و کـەمتر وەك دیاردەیـەکی مێژوویی و کۆمەلایەتی و سیاسیی مامەلـەی لەگەلـدا کـردووە، لەکاتێکـدا ئێمـە بـەگرنگی دەزانین، کە خوێنەری کورد پتر شارەزایی و ئاشنایەتی لەمەڕ ئەم دیاردە مێژووییە پەیدا بکات نەك تەنها وەك بابـەتێکی مێـژوویی، بـەلکو وەك پێویـستییەکی کۆمەلایـەتی و سیاسـیی و فیکری بۆ ئەو قۆناغەی کە لەم رۆژگارەدا ناوچەکەی پێدا تێپەڕ دەبێـت کـە ئەمـە لەدرێـژەی رووداوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا پتر دەردەکەوێ.

**ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیـە** ئەوەیـە کـە لێکدانەوەیـەکی ورد و ئەکادیمییانـەی فاکتـەر و ئەنجامەکانی ئەم دیاردە مێژووییە لەسەر بنەمای مێژوویی، کۆمەلایەتی، ئابووری، سیاسیی و فیکری وەك دەروازەیەك بۆ ئەنجامدانی لێکۆلینەوەی فراوانتر و بە پێزتر بخاتە بەردەست و ئـەم هەوڵە ببێتە سەرەتایەك بـۆ دەرکـەوتنی هەوڵـە ئـەکادیمی و زانـستییەکان بـۆ لێکۆلێنـەوە و دیراسەکردنی مێژوو و شارستانییەتە جیاجیاکانی تـر لـە پێنـاو دەوڵەمەنـدکردنی ئـەم کایـە مەعریفییە بە سوودوەرگرتن لە ئەزموون و بەرهەمی فیکـری و مـاددی ئـەو ژیارانـە، جگـە لەوەی مەبەستمانە بایەخی مێژوویی راستەقینەی ئەم بزاڤە مێژووییە وەك قۆناغێکی گرنگـی گەشەسەندنی کۆمەلایەتی بخەینەڕوو و ئەوە بلێین کە فاکتەرەکانی ئەم بزووتنەوەیـە گوزارشـت لە گەشەکردنە کۆمەلایەتییـەکان دەکـەن و ئەنجامەکانیـشی بەشـێکی دانـەبڕاون لـە رەوتـی بەرەوپێشچوونی کۆمەلگای ئەوروپا، هەروەها ویستومانە ئەو تێگەیشتنە بڕەوێنینەوە کە ئەم بزووتنەوەیـە تـەنها وەك دیاردەیـەکی ئـایینی و کێـشەی نێـوان پیـاوانی ئـایینی و هـەولی چارەسەرکردنی گەندەلی ژیانی ئایینی دەزانن.

**میتۆدی لێکۆلینەوەکە :** بەوپێیەی کە پەیوەندییەکی بەیەکداچوو و تێکئالۆسکاو لـەنێوان میتۆدە جیاجیاکانی لێکۆلینەوەدا هەیە، کە وایکـردووە زۆرجـار پابەنـد بـوون تـەنها بەیـەك

میتۆدی دیاریکراوەوە وەك ڕێبازی زانستی لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیدا مەرج نەبێت، بەڵکو بەپێی سروشتی لێکۆڵینەوەکە دەردەکەوێت، بەمەش بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان لە لێکۆڵینەوەیەکدا ڕەنگە زۆر جار تێکهەڵکێشی لەنێوان چەند میتۆدێك بخوازێت، بۆیە ئەگەرچی سروشتی بابەتەکەی ئێمە کە لە قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و فیکری دەکۆڵێتەوە و شیکردنەوەی لێکەوتە و ڕەهەندەکانی دیاردەیەکی مێژوویییە، ئەمەش پەیڕەوکردنی میتۆدی (شیکاری ـ التحليلي) دەخوازێت، بەڵام زۆرجار لەپێناو خزمەتکردن بەکێشە سەرەکییەکە و گەیشتن بە ڕاستییەکان پەنامان بردۆتە بەر میتۆدی (گێڕانەوە ـ السرد) و ویستومانە لەڕێی دەق و بەڵگەنامە و گێڕانەوەی ڕەوتی ڕووداوەکانەوە پتر لە ئامانجی لێکۆڵینەوەکە نزیك ببینەوە.

**گرفتەکانی نووسینەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە :** لێکۆڵینەوە لە بابەتێکی وەك ڕیفۆرمی ئایینی گرنگ و هەمەلایەن، وەك بەشێك لە مێژووی ئەورووپا لەناوچەیەکی وەك کوردستاندا کارێکی ئاسان نابێت و بێگومان کۆمەڵێك گرفت و ئاستەنگی دێتە ڕێ کە کەمی سەرچاوە و لەبەردەستدانەبوونی بڕی پێویست لە بەڵگەنامە و دیکۆمێنتی مێژوویی بۆ دەوڵەمەندترکردنی بابەتەکە بەر لە هەمووانە و هەژاری و زۆرجار هەر نەبوونی ئەم سەرچاوانە لە کتێبخانەکانی کوردستان و تەنانەت عێراقیش گرفتی گەورەمان بوون. نەشارەزاییمان لە زمانە ئەوروپییەکان، تایبەت زمانی ئەڵمانی گرفتێکی تری نووسینەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوو کە لە ڕاستیدا بە زانینی ئەم زمانە، یان هەر یەکێك لە زمانە ئەوروپییەکانی تر ئەم لێکۆلینەوەیە هێندەی تر دەوڵەمەند و پڕ زانیاریتر دەبوو.

ئەم نامەیە لەم پێشەکییە و سێ بەش و ئەنجام و پاشکۆکان و لیستی سەرچاوەکان و کورتەی لێکۆڵینەوەکە پێکهاتووە و هەر بەشێك بەسەر چەند باسێك و باسەکانیش بەسەر چەند تەوەرەیەکدا دابەشکراون بەجۆرە :

**بەشی یەکەم :**

ئەم بەشە کە بۆ زانینی پێناسە و چەمکی ڕیفۆرم و بارودۆخی جیهانی کاتۆلیکی بەر لە سەدەی شازدە تەرخانکراوە و گەشەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسییەکان و هەوڵ و تەقەلا ڕیفۆرمخوازییەکانی بەر لەو سەدەیە دەخاتەڕوو، بۆ چوار باسی سەرەکی دابەشکراوە بەم شێوەیە:

**باسی یەکەم:**

لەم باسەدا ئاماژە بە بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی کراوە لە رووی زمانەوانییەوە و چەمك و پێناسە جیاجیاکانی ئەم بزووتنەوەیە لە تێڕوانینە جیاجیاکانەوە خراونەتەڕوو.

**باسی دووەم :**

ئەم باسە کە بەسەر چوار تەوەرەدا دابەشکراوە، بۆ خستنەڕووی ئەو گەشەسەندنانە تەرخانکراوە، کە بەر لە سەدەی شازدە ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و فیکری و سیاسیی جیهانی کاتۆلیکی گرتبووەوە. لە تەوەرەی یەکەمدا ئەو گەشەسەندنە ئابوورییەکان روونکراوەتەوە. تەوەرەی دووەم باس لەو گۆڕانکارییانە دەکات کە بەر لە سەدەی شازدە بەسەر پێکهاتەی کۆمەلایەتی ئەو ناوچەیەدا هاتووە. لە تەوەرەی سێیەمیشدا باس لە گەشەسەندنی فێربوون و فیکر کراوە و هەولماندراو لەرێی شیکردنەوەی ئەو گەشەسەندنانەوە باس لە بزووتنەوەی رێنێساس بکەین وەك بەشێکی گرنگی گەشەسەندنی فیکری بەر لەم بزووتنەوەیە لەو ناوچەیەدا. تەوەرەی چوارەمیش بریتییە لە باسکردنی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا فۆرمی سیاسیی ناوچەکەی گرتەوە و نەخشەی سیاسیی ئەو ناوچەیە لە کاتی دەسپێکی ئەم بزووتنەوەیەدا خراوەتەڕوو.

**باسی سێیەم :**

کە بۆ مێژووی بلاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی و دەرکەوتنی کلێسای کاتۆلیکی وەك هێزێکی کۆمەلایەتی و سیاسیی دونیایی و بالادەستبوونی بەسەر تەواوی کایەکانی ژیاندا و دواجار دوورکەوتنەوەی لە بنەما و پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی و هەنگاونانی بەرەو گەندەلبوون تەرخانکراوە و بەسەر سێ تەوەرەدا دابەشکراوە. تەوەرەی یەکەم چۆنییەتی بلاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی و پەلهاویشتنی بەرەو ناوچە رۆژئاواییەکانی ئیمپراتۆرییای رۆمانی و دواتریش دەرکەوتنی وەك ئایینی فەرمی ولات رووندەکاتەوە. لە تەوەرەی دووەمدا هۆکار و هەنگاوەکانی جیابوونەوەی کلێسا و دەرکەوتنی کلێسای رۆما وەك پێشڕەوی رۆحی کلێساکانی رۆژئاوای ئیمپراتۆرییای رۆمانی باسکراوە. تەوەرەی سێیەمیش قۆناغەکانی فراوانبوونی دەسەلات و نفوزی کلێسای کاتۆلیکی دەخاتەڕوو، هەر لەم تەوەرەیەشدا هەلپە و هەولکانی کلێسا بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان باسکراوە و هەنگاوەکانی بەرەو گەندەلبوون و دەرکەوتنی وەك ئۆرگانێکی دونیایی گەورە خراونەتەڕوو.

**باسی چوارەم:**

لەم باسەدا کە بۆ ئەو هەوڵ و تەقەلا ریفۆرمخوازییانە تەرخانکراوە، کە بەر لەسەدەی شازدە رووبەرووی کڵێسای کاتۆلیکی بوونەتەوە، باس لە سەرەتاگرتن و گەشەکردنی بزاڤە دژە کڵێساییەکان کراوە هەر لەسەدەی یازدەوە تا دەرکەوتنی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی و تیشك خراوەتە سەر ئەو هەوڵانەی لەکۆتایی سەدەی دوازدەوە ناوچەکانی باشووری فەڕەنسای گرتۆتەوە وەك ئەلبیجنسی و والدینسیەکان و دواتریش ئاماژە بەو هەوڵانە دراوە، کە لەسەدەی چواردەوە لە زانکۆکانەوە دەرکەوتن و بوونە بناغەیەك بۆ بزاڤەکانی دوای خۆیان، تایبەت (جۆن ویکلف) لە ئینگلستان و (جۆن هس) لە بۆهیمیا و ئاماژەش بەهەوڵی (سافۆنا رۆلای) ئیتالی و رووبەڕووبوونەوەی لۆلاردییەکان کراوە، وێڕای ئەوەی هەوڵدراوە ئەو هەوڵانە بخرێتەڕوو کە کڵێسای کاتۆلیکی بۆ خۆپاراستن و خەفەکردنی ئەم هەوڵانە داویەتی.

**بەشی دووەم:**

ئەم بەشەش بە چوار باسی سەرەکی باس لە فاکتەرەکانی ئەم بزووتنەوەیە و ژیانی پێشەنگەکانی و بڵاوبوونەوەی ریفۆرم بەناوچەکانی جیهانی کاتۆلیکیدا دەکات بەمجۆرە:

**باسی یەکەم:**

تایبەتە بە لێکدانەوەی ئەو فاکتەر و رێخۆشکەرییانەی کە هەلومەرجی دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوە گشتگیرەیان کردووە و تیایدا هەوڵدراوە گەشەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسییەکانی دەرکەوتنی ئەو هەلومەرجە مێژووییە لەسەرەتای سەدەی شازدەدا روونبکرێتەوە.

**باسی دووەم:**

تایبەتە بە باسکردنی ژیان و کاری سێ پێشەنگە بەناوبانگەکەی ئەم بزووتنەوەیە (لوتەر) و (زوینگلی) و (کالڤن) و لەسێ تەوەرە پێکهاتووە.

تەوەرەی یەکەم وێڕای لێکدانەوەی ئەو فاکتەرانەی کە ئەڵمانیایان کردە لەبارترین شوێنی تەقینەوەی ئەم بزووتنەوەیە، باس لە ژیان و کار و رۆڵی (لوتەر) لە دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئەم بزووتنەوەیە دەکات. تەوەرەی دووەم تایبەتە بە باسکردنی ژیان و کارەکانی (زوینگلی). لە تەوەرەی سێیەمیشدا باس لە کەسایەتی و رۆڵ و کاریگەری پێشەنگی هەرە چالاکی ئەم بزووتنەوەیە (جۆن کالڤن) کراوە، هەر لە سەرەتای کارەکانییەوە لە پاریس تا مردنی لە جنێڤ.

**باسی سێیەم:**

ئەم باسە لە دووتوێی پێنج تەوەرەدا رووداوەکانی بڵاوبوونەوەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بە ناوچەکانی جیهانی کاتۆلیکیدا باسدەکات. تەوەرەی یەکەم بڵاوبوونەوەی ئەم بزووتنەوەیە لە ناوچەکانی ئەسکەندەناڤیا باسدەکات. تەوەرەی دووەم باس لە بڵاوبوونەوەی ئەم بزووتنەوەیە دەکات لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئەورووپا، هەر لەم تەوەرەیەشدا ئاماژە بە دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیە کراوە لە هۆڵەندا. تەوەرەی سێیەم تایبەتە بە باسی بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لە سکۆتلاند لەسەر دەستی (جۆن نۆکس) و بوونی پرۆتێستانتی بە ئایینی فەرمی لە وڵات. تەوەرەی چوارەمیش بۆ رووداوەکانی بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لە ئینگلستان تەرخانکراوە و تیایدا هەنگاوەکانی بەرجەستەبوونی کڵێسای ئینگلیکانی روونکراوەتەوە. لە دوا تەوەرەی ئەم باسەشدا تیشك خراوەتە سەر رەوتی رووەداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە فەرەنسا.

**باسی چوارەم :**

بریتییە لە خستنەڕووی بەشێك لە ناکۆکی نێوان بۆچوونی پێشەنگەکانی ریفۆرمی ئایینی و دەرکەوتنی بزووتنەوە ریفۆرمخوازە رادیکالەکان و بۆ دوو تەوەرە دابەشکراوە. لە تەوەرەی یەکەمدا بەشێك لە خاڵە کۆك و ناکۆکەکانی نێوان ئەم پێشەنگانە خراونەتەڕوو. تەوەرەی دووەمیش بۆ باسی ژمارەیەك لە رەوتە رادیکالەکان و ئاماژەکردن بە بیر و بۆچوونە سەرەکییەکانیان تەرخانکراوە.

**بەشی سێیەم:**

کە دوایین بەشی لێکۆلینەوەکەیە و لە ئەنجام و لێکەوەتەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی دەکۆڵێتەوە و بەسەر سێ باسدا دابەشکراوە بەجۆرە:

**باسی یەکەم:**

کە بۆ لێکۆڵینەوە لە کاریگەرییەکانی ئەم بزووتنەوەیە بەسەر ژیانی ئابووری ئەو ناوچەیەوە تەرخانکراوە، تیایدا هەوڵدراوە تیشك بخرێتە سەر کاریگەری رووداوەکانی بزووتنەوەکە لە تێکشکاندنی چەمکەکانی سەدە نێوەنجییەکان بۆ کار و دابینکردنی بژێوی و داڕشتنەوەی ئەو چەمکانەی کە دواجار خزمەتیان بە چالاکییە نوێیەکان و شێوازی نوێی ژیانی ئابووری کرد و رێخۆشکەری باڵادەستبوونی پەیوەندییە ئابوورییە سەرمایەدارییەکان بوون.

**باسی دووەم:**

ئەم باسە بۆ لێکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی تەرخانکراوە و بەسەر یازدە تەوەرەدا دابەشکراوە. تەوەرەی یەکەم لێکەوتە ئایینییەکانی بزووتنەوەکە باسدەکات و تیشك دەخاتە سەر گۆڕانی ژیانی ئایین و باوەڕی مرۆڤ و پارچەپارچەبوونی کڵێسا. تەوەرەی دووەم باس لە هۆکاری دەرکەوتنی بزووتنەوەی دژە ریفۆرمی کاتۆلیکی دەکات، لەتەوەرەی سێیەمدا ئەو ستەمکاری و توندوتیژییە خراوەتە روو کە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لەو ناوچانەدا خستویانەتەوە، تەوەرەی چوارەمیش بۆ باسکردنی دەرکەوتنی ئازادی و لێبوردەیی ئایینی وەك ئەنجامێك بۆ رووداوەکانی بزووتنەوەکە تەرخانکراوە، لە تەوەرەی پێنجەمیشدا وێڕای ئاماژە کردنمان بە هەڵوێستی نێگەتیڤانەی پێشەنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە لەمەڕ ئازادی دەربڕین و فیکر و زانست، تیشکمان خستۆتە سەر کاریگەری رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە دەستەبەرکردنی ئازادی گوتن و فیکر و کاردانەوەیان بەسەر زانستدا، تەوەرەی شەشەم بۆ دەرخستنی ئەنجامەکانی ئەم بزووتنەوەیە بەسەر نووسینەوە و خوێندنەوەی مێژووەوە تەرخانکراوە، لە تەوەرەی حەوتەمیشدا کاریگەری بزووتنەوەکە بەسەر فەلسفەوە باسدکات. لە تەوەرەی هەشتەمیشدا باس لە ئەنجامە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم بزووتنەوەیە کراوە و ئەو رۆڵە باسکراوە کە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە تەریك خستنی کلێسا لە بەڕێوەبردنی ئەرکە کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزارییەکان و باڵادەستبوونی دەسەڵاتی دونیایی گێڕاویەتی. هەرچی تەوەرەی نۆیەمیشە بۆ ئەنجامەکانی بزووتنەوەکە لە ژیانی فێربوون و پەروەردە تەرخانکراوە، بەڵام تەوەرەی دەیەم کاریگەرییەکانی بزووتنەوەی ریفۆرم لە بواری هونەر و ئەدەبدا شیدەکاتەوە. دوا تەوەرەش تیشك دەخاتە سەر رۆڵی بزووتنەوەی ریفۆرم و رەوتە ئایینییەکانی لە پێکهاتەی ئایینی ئەمریکا.

**باسی سێیەم:**

کە دوا باسی ئەم لێکۆلینەوەیەیە، بۆ باسکردنی ئەنجامە سیاسییەکانی ئەم بزووتنەوەیە تەرخانکراوە و بۆ سێ تەوەرە دابەشکراوە بەمجۆرە:

تەوەرەی یەکەم تایبەتە بەو کێشە و ئاشووبە سیاسییانەی کە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە پتر لە سەدەیەك لەو ناوچانەدا خستویانەتەوە. تەوەرەی دووەمیش کاریگەری بیری ریفۆرمیستان و رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لەمەڕ بیری سیاسیی روونەدەکاتەوە، دوا

تەوەرەی ئەم باسەش تیشك دەخاتە سەر پەیوەندی نێوان رووداوەكانی ئەم بزووتنەوەیە و دەركەوتنی خەسڵەت و سیما كۆمەڵایەتی و سیاسییەكانی ناسیۆنالیزم.

هیوادارین بەم كارەمان توانیبێتمان دیارییەكی شیاو پێشكەش بە كتێبخانەی كوردی بكەین كە لەم جۆرە بوارە پێویستەدا بەداخەوە گەلێك هەژارە.

## باسی یەکەم:

## چەمک و پێناسەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی

لەرووی زمانەوانییەوە زاراوەی ریفۆرم (Reform) لە بنەڕەتدا لە وشەی (Reformatio) ی لاتینییەوە وەرگیراوە، کە مانای نوێکردنەوە یان شێوەگۆڕین دەبەخشێت[1]، واتا ریفۆرم بریتییە لە پرۆسەی چاکسازی لە بواری (کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسیی، فیکری و ... هتد) دوای ئەوەی ژیانی کۆمەڵگا لەم لایەنانە رووبەڕووی گەندەڵی و چەقبەستن دەبێتەوە و توانای بەردەوامی و بەرەوپێشچوون لەدەستدەدات[2].

ئامانجی ریفۆرم نۆژەنکردنەوە و هەوڵی بەرەو باشتر بردنی لایەنە گەندەڵبووەکانە، بێئەوەی گۆڕانکاری ریشەیی لە کۆمەڵگادا بکرێت[3]، لە زمانی کوردیشدا وشەی چاکسازی بەرانبەر بەم زاراوەیە پتر بەکاردێت [4].

ئەم زاراوەیە لەفەرهەنگی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بۆتە ناوێکی (ئیدیۆمێک)ی مێژوویی و گوزارشت لە رووداوەکانی ئەو بزووتنەوەیە دەکات کە سەرەتای سەدەی شازدە بە کارەکانی (لوتەر) دژ بە کڵێسای کاتۆلیکیی رۆژئاوایی

---

(1) Gerhard Watlrig, Wahrig Wörterbuu, Deutches, 1- Auflages Mosaik Werlag, Munshen, 1966, P. 3021.

(2) Collins Double Book , "Dictionary and Encyclopedia", Collins , London and Glasgow, 1976, P. 405.

(3) "Webster's Third New International Dictionary of the English Language Unabridged", Amerrion-Webster, Vol.2, Merriam Company, U.S.A, 1966, P.1909.

(٤) هەردوو وشەی (Reformation) و (Renaissance) وەك زاراوە بوونەتە ناوێك و وەك ناوی کەسی لێهاتووە بۆ ئەو سەردەمە مێژووییانە و سەرچاوەکان بە زۆربەی زمانەکان هەر ئەم زاراوانە بەکاردێنن، بۆیە ئێمەش وەرگێڕانیان بە گونجاو نازانین و هەمان زاراوەی ریفۆرم و رێنێسانس بەکاردێنینەوە.

دەستپێدەکات[٥] و (زوینگلی) و (کالڤن) بوون بە دیارترین پێشەنگەکانی و رووداوەکانی تا نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدە بەردەوام دەبێت و چەندین ئەنجامی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسیی و فیکری ... هتد لێدەکەوێتەوە و کلێسای کاتۆلیکی پارچەپارچە دەکات و چەندین ئایینزای ئایینی لێدەکەوێتەوە کە پرۆتێستانتیزم دیارترینیانە و دەبێتە یەکێك لە سێ کلێسا سەرەکییەکەی ئایینی مەسیحی[٦].

هەرچەندە سەرەتا بەشی هەرە زۆری گرووپە یاخیبووەکان لە کلێسای کاتۆلیکی خۆیان بە پرۆتێستانت ناوزەد دەکرد[٧]، تایبەت لە ساڵی (١٥٢٩ ز) بەدواوە، کە لەوشەی (Protest)ەوە هاتووە و مانای (نارەزایی – رەتکردنەوە) دەبەخشێت، ئەمەش وەك ئاماژەکردن بەو نارەزاییەی میرە لۆتەرییەکانی ئەڵمانیا لەو ساڵەدا و لەئەنجوومەنی شاری سپێرس (Spires)دا بەرانبەر ئیمپراتۆر (چارلسی پێنجەم) (١٥١٩-١٥٥٨ ز) نواندنیان بۆ داکۆکیکردن لەو مافانەی کە لە ئەنجوومەنی ساڵی (١٥٢٦ ز)دا دەستەبەریان کردبوو[٨]، بەڵام وشەی ریفۆرمخواز پتر بۆ لایەنگرانی (کالڤن) بەکاردەهات[٩] کەچی بە تێپەربوونی کات

---

(٥) هەرچەندە بەر لەو مێژووە چەندین تەقەللای ریفۆرمخوازیی دراون کە دواتر باسدەکرێن، بەڵام سەرچاوەکان ئەم زاراوەیە بۆ رووداوەکانی ئەو ماوەیە بەکاردێنن، ئەگەرچی لە دەستنیشانکردنی ساڵی دەستپێکیدا جیاوازن، هەن ٣١ ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٥١٧ ز) دیاریدەکەن، واتە ئەو رۆژەی لۆتەر (٩٥) بەندەکەی لەدەرگای کلێسای ڤیتەنبرگ هەڵواسی. بروانە :

Adrian Hastings,The Oxford Companion to Christian Thought, Oxford University Press, 2000, P.601; "The New Encyclopedia Britanica",Vol.9, 15th Edition, 1986, P.995 .

بەڵام هەن ساڵی (١٥٢٠ز) بەدەستپێکی دەزانن کە (لوتەر) گڕ لە (بڕیاری بێبەریبوونی کلێسا) بەردەدات. بروانە:

F.Cuizot, The History of Civilization in Europe, G. Bell and Sons, LTD, London, 1924, P.215.

(6) "The New Encyclopedia Britannica", Vol. 9, P. 995.

(٧) زۆر جار (ئینجیلیی - Evangelical) یشیان بەکاردەهێنا بۆ خۆجیاکردنەوە لە کاتۆلیکەکان، بۆیە ئێستا زۆرجار بە ئینجیلی دەناسرێن. بروانە: "The New Encyclopedia Britannica", Vol.9, P. 996.

(8) Arthur Hassll, European History. Chronologically Arranged (476-1920), Macmillan and Co., London, 1925, P.118.

(9) "The New Encyclopedia Britannica", Vol.9, P. 996.

ریفۆرم بوو بەو زاراوەیەی کە ئاماژە بە تەواوی رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بکات لە نێو مێژوونووساندا، تایبەت لەسەدەی نۆزدە بەدواوە(١٠).

ئەگەرچی تا ئێستاش ژمارەیەك لە مێژوونووسان کاتێك باسی ئەم بزووتنەوەیە دەکەن دەستەواژەی (بزووتنەوەی پرۆتێستانتی) بەکاردێنن، بەلاّم ئەم دەستەواژەیە زۆر لەوە بەرتەسکترە کە بتوانێت ئاماژە بە تەواوی رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بکات، چونکە چەندین گرووپ و تیرەی یاخیبوو دەرکەوتن کە بەناوی پرۆتێستانتی رازینەبوون، لەوانە (ئەناباپتیست – Anabaptist و پیۆریتان – Puritan و هتد ..) وێڕای (دژە ریفۆرمی کاتۆلیکییەکان – Counter Reformation)(١١) پرۆتێستانتیش بوو بە یەکێك لەو گرووپە یاخییانە، بۆیە ئێمە بەکارهێنانی (ریفۆرم - Reform) بەشیاوتر دەزانین کە بتوانێت گوزارشت لە سەرلەبەری رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بکات.

زاراوەی ریفۆرم دوای ئەوەی ئەم مانا مێژووییەی وەرگرت، لەفەرهەنگی هەر یەك لە کاتۆلیك و پرۆتێستانتەکاندا لێکدانەوەی جیاوازی بۆ کرا. کاتۆلیکەکان ئەگەرچی زۆرێك لە مێژوونوسەکانیان لەم دوادواییانەدا ئاماژە بە گەندەڵییەکانی کڵـێسای سەدە نێوەڕاستییەکان و نەکارایی لەخۆگونجاندن لەگەڵ رەوشە نوێیەکەدا دەکەن، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بۆ ئەم رووداوە بەشیاو نازانن و پێیانوایە ئەم رووداوە تەنها ویستی جیابوونەوە لە کڵـێسای کاتۆلیکی و کردارێکی کاولکاری بووە و هیچی تر(١٢).

بەلاّم پرۆتێستانتییەکان تەواو پێچەوانەی کاتۆلیکەکان ئەم بزووتنەوەیە بە چاکسازییەکی گەورە دەزانن کە بەسەر ژیانی ئایینی و گەندەڵی کڵـێسا و پیاوانی ئایینی سەدە نێوەڕاستییەکاندا هات(١٣)، تەنانەت بە لای ژمارەیەکیانەوە ئەم دیاردەیە هەڵقوڵاوی

---

(10) Adrian Hastings, Op.Cit., P. 601.

(١١) لە بەشەکانی داهاتوودا پتر باسی ئەم ئایینزا و گرووپانە دەکەین.

(١٢) جان کميي، دليل الى قراءة تاريخ الكنيسة، الترجمة والمراجعة أيوب زكي الفرنسيسكاني وآخرون، دار المشرق، بيروت، د.ت.، ص٢٣٠؛ دونالد ر. كيلي، بدء الايديولوجية في الغرب. دراسة في الوعي والاجتماع (فرنسا في عهد الاصلاح الديني)، ترجمة محمد جعفر داود، مراجعة د. واثق عباس الديني، دار الشوون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٠، ص٤٠.

(13) Edward Raymond Turner, Europe (1450 – 1789), Garden City and New York, 1921, P. 150.

کۆمەڵگای مرۆیی نییە، بەڵکو هێزێکی یەزدانییەو بۆ خاوێنکردنەوە و ژیاندنەوەی لایەنی ڕۆحی مرۆڤی مەسیحی هاتووە[14]. هەرچۆنێك بێت هەردوولا لە ڕوانگەیەکی ئایینییە وە تەنها وەك کێشەیەکی ڕۆحی نێو کڵێسا دەڕواننە ئەم ڕووداوە، کە لە ڕاستیدا ئەم جۆرە تێڕوانینە لەلایەن چەندین بیریار و مێژوونووسەوە دووپاتکراوەتەوە هەرچەندە ژمارەیەکیان گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسیی و فیکرییەکانیش لەبەرچاو دەگرن، بەلاّم بەو پێیەی گوایە ئەم بزووتنەوەیە لەسەر دەستی پیاوانی ئایینی و لە نێو کڵێسادا دەرکەوتووە، بۆیە تەنها بە کێشەیەکی ئایینی دەزانن[15]، ئەمە جگە لەوەی بالآدەستی و زەقیی لایەنی ئایینی بەسەر ڕووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیەوە وایکردووە کە زۆرێك لە بیریاران لەکاتی پێناسکردنیدا ئاماژە بەوە بکەن کە لەسەرەتادا بزووتنەوەیەکی ئایینی و تیۆلۆجی بووە، بەلاّم دواجار کاریگەری و ئەنجامگەلێکی کۆمەلآیەتی و سیاسیی گەورەی لێکەوتۆتەوە[16].

هەرچەندە ناکرێت ڕۆڵی ئایین و لایەنی ڕۆحی لە سەردەمێکی وەك کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا و لە بزاڤێکی وەك ڕیفۆرمی ئایینیدا فەرامۆش بکرێت، کە ئەگەر هیچ نەبووبێت ڕەنگرێژکەری تەواوی ڕووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بووە، جگە لەوەی پارچەپارچەبوونی کڵێسا و گۆڕانی ژیانی ئایینیش لە ئەنجامە گرنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە بوون، بەلاّم ئەمە کورتبینییەکی مێژوویی گەورەیە، ئەگەر ئەم بزووتنەوەیە تەنها وەك ڕووداوێکی ئایینی تەماشا بکرێت، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تاوتوێــــکردنی فاکتەرەکانی ئەم بزووتنەوەیە تەنها لە مەودایەکی مێژوویی تەسکدا، کە لە نێوانیاندا گەندەڵبوونی

---

(14) J.A. Wylie, The History of Protestantism, Book first, cassell and Company, London, Paris and New York, P.2. www.bpc.org/resource /books/wylie.

(١٥) بڕوانە: رولان موسنییە، تاریخ الحضارات العام (القرنان السادس عشر و السابع عشر)، ترجمة یوسف اسعد وفرید م. داغر، المجلد الرابع، عویدات للنشرو الطباعة، بیروت، ٢٠٠٣، ص١٠٦؛ هوستن سمیث، ادیان العالم. دراسة روحیة تحلیلیة معمقة لادیان العالم الکبری توضح فلسفة تعالیمها وجواهر حکمتها، ترجمة سعد رستم، دار الجسور الثقافیة، حلب ، ٢٠٠٥، ص٤٥٢ .

(١٦) بڕوانە: سارا فلۆوەرز، ڕیفۆرم، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، داناز، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٤. هەروەها دانىنج (Danning) پێیوایە کە ئەم بزووتنەوەیە لەسەرەتادا مۆرکێکی تیولۆجی وەرگرتووە، بەلاّم دواتر کاریگەرییەکانی لایەنی فیکر و فەلسەفە و سیاسەتی گرتۆتەوە. بڕوانە: عبدالجبار عبد مصطفی، الفکر السیاسي الوسیط والحدیث، من مطبوعات وزارة التعلیم العالي والبحث العلمي، جامعة الموصل، ١٩٨٢، ص٦١.

کڵـێسا لە هەموان زەقتر دەردەکەوێت بـێنەوەی بە ناخی گۆڕانکارییـە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکرییەکاندا قووڵبینەوە کە لە راستیدا خودی فاکتەرەکانی گەندەڵبـوونی کڵـێسا لەوێوە سەرچاوە دەگرن.

کڵـێسای کاتۆلیکی و بگرە سەرلەبەری ئایینی مەسیحی بۆخۆی بەشێکی دانەبڕاوی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و فیکری کۆمەڵگای ئەوروپی بوو لەسەدە نێوەنجییەکاندا و ڕەگ و ریشەی لەسەردەمێکی مێژوویی دواکەوتوودا داکوتابوو، کاتێك کشتوکاڵ و ئابووری داخراو ناوچەکەیان بەڕێوەدەبرد و کۆمەڵگا لەوپەڕی نەزانین و نەخوێندەواریدا دەژیا، ئەمەش ببووە زەمینەســـــازێکی لەبار بۆ بلاوبوونەوەی بیروڕا ئایینییە (Dogma - عیقیدەییەکان)ی کڵـێسا کە تەواوی بوارە کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسییەکانی ئەو رۆژگارەی گرتبووەوە بەجۆرێك لە ناخی کۆمەڵگادا جێگیرببوو کە تەواوی کون و کەلێنەکانی تەنیبووەوە و ئیدی جیاکردنەوەی لایەنە ئایینی و دونیاییەکان کارێکی زۆر ئەستەم بوو[١٧].

بەلاّم گیشەکردنی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و بەرەوپێشچوونی مەعریفە و خوێندەواری و فیکر لە لایەك و سستی هەنگاوەکانی کڵـێسا لە گۆڕاندا لە لایەکی ترەوە رۆژ بـــــە رۆژ کەموکورییەکانی کڵـێسای پتر دەردەخست و خەڵکیش لە ئاست هەستکردن بەو کەموکورپیانە ورياتر دەبوون، ئەمەش لەو کاتەدا لە شێوەی گەندەڵی کڵـێسا دەردەکەوتن، بۆ نموونە (لوتەر) کە رەخنە لە (پسولەی لێبوردن – صكوك الغفران – Indulgence) دەگرێت نازانێت ئەمە ئەنجامی دەرکەوتن و زیادبوونی رۆڵی دراوە لە ژیانی نوێی ئابووریدا کە وای لە کڵـێسا کردووە بەم چەشنە پارە و پول کۆبکاتەوە، ئەمەش پێشکەوتنی هۆشیاری کۆمەڵگایە کە ئەمجۆرە کردارەی پێ پەسند ناکرێت، ئەگەرنا زۆر لە مێژ بوو کڵـێسا بە شێوازی بێگار و سەدەقە و بەشە شمەك و ... هتد، ئەمجۆرە سەرانەیەی لە خەڵکی وەردەگرت.

بەلاّم تێڕوانینێکی تر هەیە، ریفۆرمی ئایینی بە چارەسەرێکی مامناوەندی دۆزی کۆتایی سەدە نێوەنجییەکان دەزانێ، بەو پێیەی کە کۆمەڵگا سەرەڕای هەموو ئەو پێشکەوتنەی لەوکاتەدا بەخۆیەوە بینیبووی، تایبەت دوای رێنێسانس و تێکشکاندنی زۆرێك لە پەیوەندییە کۆنەکان لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئامادەییەی تێدا نەبوو کە دەستبەرداری تەواوی

(17) "The Cambridge Modern History",Vol. 1, Cambridge University Press, 1969, P. 653.

نەریت و پرەنسیپە کۆنەکان بێت، بۆیە کۆمەڵـــگـا پێویستی بە چارەیەکی مامناوەندی بوو کە لە ریفۆرمی ئایینیدا خۆینواند[18].

(تۆماس کارلایل) کە تەواوی مێژوو بە بەرهەمی فیکر و کارەکانی پیاوە مەزنەکان دەزانێت، (لوتەر) بە یەکێك لەو رابەرانە دادەنێت، ئەم بزووتنەوەیە و سەرلەبەری مێژووی نوێی ئەوروپا بە ئەنجامی کارەکانی (لوتەر) و پاشگەز نەبوونەوەی لە هەڵوێستەکانی لە بەرانبەر ئیمپراتۆردا لە ئەنجوومەنی شاری (ورمز- Wormes) ی ساڵی (١٥٢١ز) دەزانێت[19]. هەرچەندە ناکرێت رۆڵی کارەکانی (لوتەر) و هیچ یەکێکی تر لە پێشڕەوانی ئەم بزووتنەوەیە وەك فاکتەرێکی دەرکەوتنی بزووتنەوەکە فەرامۆش بکرێت، بەلاّم بەلای ئێمەوە ئەوە گۆڕانی بارودۆخەکەیە کە لە لایەك رۆژ بە رۆژ لە دەسەلاّت و هەیبەتی کلـێسای کەم دەکردەوە، لە لایەکی تریشەوە رق و کینەی کۆمەڵی بەرانبەر کلـێسا پتر دەکرد و نەیارانی لەنێو چین و توێژە جیاجیاکاندا زۆرتر دەکرد، بەمەش ئەو هەلومەرجەی بۆ (لوتەر) دەڕەخساند کە بتوانێت گڕ لە بڕیاری بێبەریکردنی کلـێسا (Excommunication) بەربدات، ئەوەی بەر لە چەند سەدەیەك لە توانای ئیمپراتۆرێکدا نەبوو بیکات[20]. بۆیە ئەمە شێوازی نوێی ژیان و بیرکردنەوەیە کە هەلومەرجی مێژوویی دەڕەخسێنێ و کەسانی وەك (لۆتر) بەرهەم دێنێت.

لێکدانەوەی چینایەتی، تێڕوانینی گرووپێکی تری بیریارانە سەبارەت بەم بزووتنەوەیە، لایەنگرانی ئەم تێڕوانینە دەڵێن هاوکات لەگەڵ لەبەریەکهەڵوەشانەوەی کۆمەڵـــگـای دەرەبەگایەتیدا چین و توێژی نوێ دەرکەوتن کە خاوەن شێوازێکی نوێی ژیان و بیرکردنەوە

---

(١٨) عبدالجبار عبد مصطفی، المصدر السابق، ص ٦١؛ John Herman Randall, The Making of The Modern Mind, Revised Edition, Hougton Mifflin Company, 1940, P. 143.

لە عەرەبییەکەدا، جون هرمان راندل، تکوین العقل الحدیث، ترجمة جورج طعمة، مراجعة برهان الدین دجاني وتقدیم د. محمد حسین هیکل، الجزء الاول، مؤسسة فرانکلین للطباعة والنشر باشتراك مع دار الثقافة، بیروت، ١٩٥٨، ص ٢٢٤- ٢٢٥.

(19) بڕوانە: توماس کارلایل، الابطال ، دار الکاتب العربي، بیروت ، د.ت.، ص ١٤٨ — ١٥٥.

(٢٠) بۆنموونە بڕوانە: کێشەی نێوان ئیمپراتۆر هێنری و پاپا گریگۆری حەوتەم لەم سەرچاوانە:

T.F. Tout, The Empire and The Papacy (918-1273), 3rd Edition, Rivingtons, London, 1946, PP.125-132; Christopher Brooke, Europe in the Central Middle Ages (962-1154) 2nd Impression, Longman, London, 1966, PP. 269-274.

بوون کە جیاواز بوو لە بیرکردنەوەی سەدە نێوەنجییەکان، تایبەت چینی بۆرجوازی کە تادەهات شوێن و پێگە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەی لە پەرەسەندندابوو، بەڵام پەیوەندییە دەرەبەگایەتییە کۆنەکان ببوو بە تەگەرە لە بەردەم بەرژەوەندییەکانیاندا، بۆیە تێکوپێکشکاندنی سەرتاپای ئەم پەیوەندییەی کە کڵێسا بناغەی ئایدۆلۆجی پێکدەهێنا، بوو بە ئامانجی ئەم چینە، بۆیە ناکرێت کڵێسای کاتۆلیکی ئامانجی ئەو پرۆسەیە نەبێت بۆ ئەوەی شێوازێکی نوێی کڵێسا بێتە ئاراوە کە لەگەڵ پەیوەندییە نوێیەکاندا بگونجێت، بەم پێیەش ریفۆرمی ئایینی بەلای ئەوانەوە بەشێکی دانەبڕاوی خەبات و ململانێی چینی بورجوازی پێکدەهێنێت، بەڵام لە ژێر پەردەی ئاییندا[٢١].

هەرچەندە ئێمە لەو روانگەیەوە دەڕوانینە ئەم بزووتنەوەیە کە ئەنجامێکی حەتمی ئەو گەشەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتییە بوو کە لەو رۆژگارەدا ئەورووپای گرتبووەوە و ئەم بزووتنەوەیە بە بەشێکی دانەبڕاوی هەنگاوەکانی دەرکەوتنی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان دەزانین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێناچێت سەرلەبەری ئەم بزووتنەوەیە لەو سەردەمە مێژووییەدا گوزارشت لە بەرژەوەندی تەنها چینی بۆرجوازی بکات، بەڵکو بەرژەوەندی زۆرێك لە میرەکان و پاشاکان و هەروەها تەواوی ئەو چین و توێژە کۆمەڵایەتییانەی کە تامەزرۆی رزگاربوون بوون لە کۆت و بەندەکانی سیستمی دەرەبەگایەتی و کڵێسای کاتۆلیکی بارتەقای بەرژەوەندی چینی بۆرجوازی رۆڵیان بینیوە، بۆیە پێمانوایە لەو قۆناغەدا گونجاوترە، ئەگەر بڵێین بەرژەوەندی تەواوی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان ئەمەی خواستووە و لە قۆناغەکانی دوایشدا بە تەواوی بەرژەوەندی چینی بۆرجوازی روونتر کردۆتەوە.

---

(٢١) بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

"عرض اقتصادي تاريخي. تشكيلات ما قبل الرأسمالية"، جامعة باتريس لومومبا للصداقة بين الشعوب، الجزء الأول، مكتبة التحرير ، بغداد، د.ت.، ص ٢٨١-٢٨٢؛ عبدالعظيم رمضان، تاريخ اوروبا والعالم الحديث من ظهور البورجوازية الاوروبية الى الحرب الباردة (من ظهور البورجوزاية الى الثورة الفرنسية)، الجزء الاول، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٧، ص ١٠٤-١٠٧؛ Frederick Engels, The Peasant War in Germany, Ch2.

www.Marxists.org/Archive/marx/works/1850/Peasant-War-germany/ch02-html.

مێژوونووسی بەناوبانگ (فیشەر) کاتێك باسی ئەم بزووتنەوەیە دەکات، پێیوایە شۆڕشێك بووە لە دژی دەسەڵاتی پاپا و ئیمتیازی پیاوە ئایینییەکان (ئەکلیرۆس) و گیانی (پاگانیزم – الوثنية)ی لای گەلانی دەریای ناوەڕاست لەیەك کاتدا[٢٢]، کەواتە بەلای ئەوەوە ریفۆرمی ئایینی چەند دژ بە کڵێسا بووە هێندەش دژ بە رێنێسانس بووە، ئەمە لە کاتێکدا هەندێك سەرچاوە بە پێچەوانەوە دەڕواننە پەیوەندی نێوان ئەم دوو بزووتنەوەیە و پێیانوایە کە دوو بزووتنەوەی هاوبەش و هاوئامانج بوون و هەوڵیانداوە لە رێی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە دێرینەکان، مرۆڤی سەدە نێوەنجییەکان لە کۆت و بەندی کڵێسای کاتۆلیکی رزگار بکەن[٢٣]، بەڵام مێژوونووسی وا هەیە کە پێیوایە ریفۆرمی ئایینی بریتییە لەو بزووتنەوەیەی کە ئاراستەی رێنێسانس و مەیلە لیبرالییەکانی بەرەو ژیانی مەسیحی گۆڕیبێت و کۆمەڵگای لە بزووتنەوەیەکی کارەسات ئامێز رزگارکردبێت[٢٤].

راستییەکەی ئەم دوو بزووتنەوەیە وەڵامدانەوەی ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکرییە بوون کە ئەو رۆژگارە ئەورووپای گرتبووەوە و ئامانجیان راماڵینی پەیوەندییە کۆنەکان بوو کە ببوون بە لەمپەر لە بەردەم رەوتی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا و کارەکانیان کە بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە دێرینەکان دەستیپێکرد و دیاردەکانی رێنێسانس زەمینەیەکی بەرفراوانیان بۆ دەرکەوتنی ریفۆرمی ئایینی سازکرد، هەرچەندە لە شێوازی بەرێوەچووندا هەریەك تایبەتمەندی و خەسڵەتی خۆی هەبوو. رێنێسانس کەلتوور و فەلسەفەی (گریك و رۆمی) کرد بە سەرچاوەی کارەکانی و بەمەش پتر مۆرکێکی دژە ئایینی و

---

(22 ) H.A.L. Fisher, A History of Europe, London, 1957, P. 498.

لە عەرەبییەکەدا: هـ.أ. فشر، أصول التأريخ الاوربي الحديث من النهضة الاوربية الى الثورة الفرنسية، ترجمة د. زينب عصمت راشد و احمد عبدالرحيم مصطفى، مراجعة د. احمد عزت عبدالكريم، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٧٦، ص٩٥ .

(٢٣) بۆ نموونە بڕوانە: يوهان هويزنجا، اعلام وأفكار. نظرات في التاريخ الثقافي، ترجمة عبدالعزيز توفيق جاويد، مراجعة د. زكي نجيب محمود، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧٢، ص ٣١٩-٣٢٠ ؛ كرين برينتون، تشكيل العقل الحديث ، ترجمة شوقي جلال، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠١، ص ١٩ – ٢١.

(24) Philip Schaf, A History of the Christian Church. History of Modern Christianity, the Reformation, Vol. 7, Scahff, Power Search, 1910, Ch1. www.ccel.org/s/schaff/history/7-ch 01.htm.

پاگانیزمی پۆشی و زیاتر لایەنی فیکر و هونەر و ئەدەب بوون بە ئامانجی کارەکانی، کەچی ریفۆرمی ئایینی هەستیارترین و دوایین بەشی پەیوەندییە کۆنەکانی کردە ئامانجی کارەکانی کە خۆی لە ژیانی ئایینی و دەسەلاتی سیاسیدا دەبینییەوە کە لە ژێر دەسەلاتی پاپادا چڕبوونەوە، بۆیە لە رێی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە بێگەردەکانی ئایینی مەسیحی و ئینجیلەوە دەستی بە هێرشکردنە سەر دەسەلاتی پاپا کرد و هەر ئەوەش بزووتنەوەکەی کردە بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتی — سیاسیی توندوتیژ و فراوان.

لەژێر تیشکی تاوتوێکردنی ئەو بۆچوونانەی باسکران، ئەوەمان بۆ رووندەبێتەوە کە ریفۆرمی ئایینی بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتی، سیاسیی، فیکری، ئایینی بوو کە سەرەتای سەدەی شازدە جیهانی کاتۆلیکی گرتەوە و بوو بە توندوتیژترین و دوایین هەنگاوەکانی پرۆسەی وەرچەرخانی کۆمەلـــگـا لە سەدە نێوەنجییەکانەوە بۆ سەدە نوێیەکان لە جیهانی کاتۆلیکی ئەوروپادا.

## باسی دووەم:

# گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی بەر لە بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی

لە سەدەی شازدەدا رۆژئاوای ئەوروپا ببوو بە شانۆی زنجیرەیەك راپەڕین و شەڕ و ئاشووبی نەپساوە و تەوژمی گۆرانکارییەکی گەورە ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و فیکری ئەو ناوچەیەی گرتبووەوە، کە رەگ و ریشەیەکی قووڵیان لە ناخی رووداوەکانی سەدەکانی پێشتردا هەبوو و زادەی پرۆسەیەکی مێژوویی درێژخایەن بوون کە بە جیابوونەوەی بازرگانی و پیشەگەری لە کشتوکاڵ و بووژانەوەی شار دەستیپێکرد و جەنگی خاچییەکان و رێنێسانس و دۆزینەوە جوگرافییەکان بوونە گرنگترین دیاردەکانی و دواتریش ریفۆرمی ئایینی بەشی هەرە گرنگی ئەم پرۆسەیەی پێکهێنا و سەرجەمیان گوزارشت لەهەنگاوەکانی لەبەریەکهەڵوەشانەوەی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان و دەرکەوتنی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان دەکەن و دیاردەکانی گواستنەوەی کۆمەڵگان لە سەدە نێوەنجییەکانەوە بەرەو سەدە نوێیەکان، بۆیە هەوڵدەدەین بە ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لەو رووداوانە باردۆخی سەدەی شازدە بخەینە روو.

### تەوەرەی یەکەم: گەشەسەندنی ئابووری

دوای ئەوەی لە سەرەتای سەدە نێوەنجییەکان بەدواوە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك ژیانی ئابووری لە رۆژئاوای ئەوروپادا بەرەو لاوازی چوو، کشتوکاڵ و بەرهەمهێنانی خۆبژێوی ( Self - Sufficiency) بوون بە بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووری و شارەکان پوکانەوە و مەکۆی ژیان بەرەو گوندەکان چوو[٢٥]. لەسەدەی یازدەوە لە ئەنجامی پێشکەوتنی ئامێرەکانی کار و

(٢٥) کلود دلماس، تاریخ الحضارة الاوروبیة، ترجمة توفیق وهبە، بیروت، ١٩٧٠، ص٢٦؛
Frederic Austin Ogg, Economic Development of Modern Europe, 11th Printing, The Macmillan Company, 1950, P. 43.

زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان و هێوربوونەوەی هێرش و شەڕوشۆڕی هۆزە جەرمانییەکان[٢٦]، بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و زێدەبەرهەم دەرکەوت و هێدی هێدی بازرگانی و پیشەگەری لە کشتوکاڵ جیابوونەوە و شار وەك ناوەندی لەخۆگرتنی بازرگان و پیشەگەران بوژایەوە[٢٧] و شار و گوند پێکڕا بوون بە دابینکەری پێداویستییە ئابوورییەکانی یەکدی و لێرەوە دیاردە ئابووریبە سەرمایەدارییەکان لەهەناوی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانەوە چەکەرەیانکرد و دەستیان بە نەشونما کرد.

جەنگی خاچییەکان گوڕوتینێکی گەورەی بەم پرۆسەیە بەخشی ئەویش بە دووبارە والاکردنەوەی دەرگای بازرگانی رۆژهەلات بە رووی رۆژئاوادا لە ریگای دەریای ناوەڕاستەوە، هەروەها ئاشنابوونی رۆژئاواییەکان بە چەندین شێوازی نوێی کشتوکاڵ و پیشەگەری، ئەمەش پێشکەوتنێکی ئابووری گەورەی لێکەوتەوە[٢٨]. بازرگانی و بازاڕ شانبەشانی گەشەسەندنی پرۆسەی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی ژیانی ئابووری پێشدەکەوتن و هەر زوو چەندین بازاڕی وەرزی (Fair) لە وێنەی (شامپانی - Champagne) لە فەرەنسا بوونە ناوەندی کۆبوونەوەی بازرگانەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپا[٢٩].

دەرکەوتنەوەی نرخ و دراو دوای ئەوەی لەسەدە نێوەنجییەکاندا بەرەو نەمان چووبوو، وەك پێویستییەك لە پێناو بەردەوامی رەوتی پێشکەوتنی بازرگانی و بازاڕدا رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە ڕێکخستنی پەیوەندییە ئابوورییە نوێیەکان و هاوکات چەندین پیشەی بە قازانجی وەك (دراوگۆڕ — Money change ) و (سوخواردن -پارە بەکرێدان- Money Lender) ی لێکەوتەوە، کە

---

(٢٦) فرنان برودل، هوية فرنسا (الناس والاشياء)، ترجمة بشير السباعي، المجلد الثاني، الجزء الاول ، القاهرة، ٢٠٠٠، ص١٢٦.

(27) Carl Stephenson, Medieval History. Europe from the Second to sixteenth Century, 3rd Edition, Harper and Brothers, New York, 1951, P. 235;

نعيم فرح ، تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، مطبعة طربين، جامعة دمشق، ١٩٧٧-١٩٧٨، ص٢٣٨.

(٢٨) بروانە: راغب حامد عبدالله، الحروب الصليبية. بدايات الاستعمار الاوروبي، رسالة ماجستير ، كلية الاداب جامعة الموصل، نيسان ١٩٨٣ ، ص٢٠٥-٢١٣ ؛ ول ديوارنت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد الرابع، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٩٦٥، ص٦٨-٦٩.

(29) Ernst Brisach, Renaissance Europe 1300-1517, New York, 1973, P. 27.

رۆڵێکی گەورەیان لە کەڵەکەبوونی سەرەتایی سەرمایەی بازرگانیدا گێڕا[٣٠]، لەم بوارەشدا چەندین بنەماڵەی بەناوبانگ دەرکەوتن و لق و پۆپیان بە زۆربەی شارەکانی رۆژئاوای ئەوروپادا بلاوبووەوە.

بنەماڵەی (فیگور - Fugger)[٣١] لە ئەڵمانیا و بنەماڵەی (میدیی –Midici)[٣٢] لە ئیتالیا لە بەناوبانگترین ئەو بنەماڵانە بوون، تەنانەت بنەماڵەی فیگور لە سەرەتای سەدەی شازدەدا سەرمایەکەی بە تەواوی شارە گەورەکانی ئەوروپادا بلاوبووبووەوە و لە سەرجەم بوارە بازرگانییەکاندا کاریدەکرد و لە زۆربەی شارەکاندا مانیفاکتۆرەی[٣٣] هەبوو[٣٤].

---

(30) James Westfall Thompson, Economic and Social History of Europe in the Latter Middle Ages (1300-1530), A. C, NewYork and London, 1931, P. 12.

(٣١) رەچەڵەکی ئەم بنەماڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێك ناوی فیگۆر بووە کە لەخێزانێکی جۆلای شاری ئۆگسبۆرگ بوو، دواتریش بووە سەرۆکی سەندیکای بازرگانی شارەکە، ساڵی (١٤٠٨ز) مردووە و (جاکوب)ی کوڕی شوێنی گرتوتەوە. دواجار ئەم بنەماڵەیە بوون بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین بنەماڵەکانی ئەڵمانیا، تا لە سەدەی شازدەدا سامانەکەیان خۆی لە (٤ ملیون) گڵدن دەدا. سەروەت و سامانی ئەم بنەماڵەیە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە دۆزینەوە جوگرافییەکان و هەروەها لە هەڵبژاردنی (چارلسی پێنجەم) بە ئیمپراتۆر. بڕوانە :
J.H. Carlton Hayes, Modern Europe to 1870, 5th Printing, The Macmillan Company, New York, 1959, P. 85.

(٣٢) بنەماڵەی میدیسی لە لایەن (جیۆڤانی Giovanni) – یەوە دامەزرا کە یەکێك بوو لە بازرگانەکانی فلۆرەنسا، ساڵی (١٤٢٩ز) مردووە و کوڕ و نەوەکانی لە دوای خۆی زۆر هەڵپەی جڵەوی سیاسییان دەکرد تا دواجار لۆرینزۆی مەزنی نەوەی (١٤٤٩-١٤٩٢ز) توانی حوکمڕانی شاری فلۆرەنسا بگرێتەدەست، سەروەت و سامانی ئەم بنەماڵەیە رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە کۆکردنەوەی سەرچاوە و شوێنەوارە دێرینەکانی (گریك و رۆم) و بزووتنەوەی رێنێسانس. بڕوانە:
R.R. Palmer, A History of the Modern World to 1815, 9th Edition, USA, 2002, P. 56.

(٣٣) مانیفاکتۆرە Manufacture - ئەم وشەیە لە دوو وشەی لاتینی پێکدێت (Manus) واتە دەست، (Factua)واتە بەرهەم، بەیەکەوەش مانای بەرهەمی دەستی دەبەخشێت، ئەم جۆرە بەرهەمهێنانە لە لایەن بازرگانە گەورەکانەوە دەرکەوت، کە تامێری نوێیان دابیندەکرد و چەند پیشەگەرێك بە کرێ کاریان لەسەر دەکرد و سەرەتا بە دوو جۆر دەرکەوت، یەکێکیان مانیفاکتورەی (پەرتەوازە – المتشتتة) کە بەرهەمهێنەکان لە چەند شوێنێك یان لە ماڵەکان بەجیا بەرهەمیان دەهێنا، جۆرەکەی تریش مانیفاکتۆرەی (یەکگرتوو – الموحد) کە کرێکارەکان بەیەکەوە لەیەك شوێندا کاریاندەکرد، کە ئەمجۆرەی دووەم دواجار زەمینەی دەرکەوتنی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری فراوانی خۆشکرد، بڕوانە: "عرض اقتصادي تاريخي"، المصدر السابق، ص٢٧٢.

(34) Thomas M. Lindsay, A History of Reformation, Vol. 1, 2nd Edition, New York, 1953, P. 85.

پیشەسازی[٣٥]، هاوکات لەگەڵ فراوانبوونی بازاڕ و پێشکەوتنی ئامێرەکانی کاردا لە گەشەسەندنی بەردەوامدا بوو، تایبەت بە زۆربوونی رێژەی ئاشی ئاوی و دەرکەوتنی ئاشی هەوایی کە لە چەندین بواری جیاجیادا بەکاردەهێنرا، تەنانەت ئاشی هەوایی بە ئاشی سەرمایەداری ناوزەد دەکرێت[٣٦]. هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنی بەرهەمهێنانی پیشەگەریدا تایبەتمەندبوون (التخصص) کە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری تادەهات قووڵتر دەبوو، لە سنووری تاکەکان و پیشەکان دەردەچوو، هەرێم و ناوچە جیاجیاکان بە پێی هەڵکەوتەی جوگرافییان و بوونی کەرەستەی خاو لە بوارێکی تایبەتی بەرهەمهێناندا تایبەتمەنددەبوون[٣٧]، بۆ نموونە (فلۆرەنسا — Florence) بەناوبانگترین ناوچەی رستن و چنین بوو و لە ساڵی (١٣٣٨ز) نزیکەی (٢٠٠) مانیفاکتۆرەی ئەمجۆرە بوارەی تێیدابوو، هەروەها چەند ناوچەیەکی باکووری ئەڵمانیا و ژمارەیەك ناوچەی باکووری هەنگاریا بە بەرهەمە کانزاسازییەکان بەناوبانگ بوون و ئاتاجی ناوچەکانی تریان لەم رووەوە دابیندەکرد[٣٨]، ئەمە وێڕای پێشکەوتنی پیشەسازی کەشتی لە چەند شارێکی ئیتالیا و دەرکەوتنی پیشەسازی چاپەمەنی[٣٩] لە نیوەی دووەمی ســـەدەی پـازدەوە.

---

(٣٥) هەردوو وشەی پیشەسازی و پیشەگەریمان بەکارهێناوە، چونکە لەڕووی مێژووییەوە وشەی پیشەسازی بۆ پرۆسەیەکی بەرهەمهێنانی ئاڵۆزتر لە پیشەگەری بەکاردێت، کە لە قۆناغی مانیفاکتۆرەوە پتر بەکاردێت.

(٣٦) کاریگەری ئەم ئاشە بە شۆڕشی هەڵمیی سەدەی نۆزدە بەراورد دەکرێت، لە کۆتایی سەدەی پازدەدا نزیکەی (٢٠,٠٠٠) ئاشی لەمجۆرە لە ئەوروپا هەبوو. فرنان برودل، المصدر السابق، ص١٣٩ — ١٤٠.

(37) Denys Hay, Europe in Fourtenth and Fifteenth Century, 4th Impression, Longman, London, 1971, P. 16; "عرض اقتصادي تأريخي"، المصدر السابق، ص٢٦٩

(38) Wallace K. Ferguson and Geoffrey Bruun, A Survey of European Civilization, 3rd Edition, New York, 1962, P. 314.

(٣٩) چاپەمەنی پیتە بزۆکەکان بۆ یەکەمجار لە ئەوروپا پێدەچێت لە شاری (هارلم (Harlem - لە زەوییەنزمەکان دەرکەوتبێت و لە لایەن (لۆرنس کۆستر ( Laurence Coster – ەوە بەکارهاتبێت، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە کە (جۆن گۆتنبێرگ (John Gutenberg) (ساڵی (١٤٥٠ ز) لە شاری (ماینز (Mainz – ی ئەڵمانیا بەکاریهێناوە و سەرەتا (پسولەی لێبووردنی) پێ چاپکردووە و دواتریش چەند بەشێکی ئینجیل، لەوێشەوە بە ناوچەکانی تری ئەوروپادا بلاوبووەتەوە، ساڵی (١٤٦٦ز) یش لە رۆما چاپخانە دامەزرا و لە سەرەتای سەدەی شازدەشدا چاپخانە لە سەرجەم شارە گەورەکانی ئەوروپادا هەبوو. بڕوانە:

Hayes, Modern Europe…, P. 94.

لە رۆژئاوای ئەوروپادا[40].

کشتوکاڵ هەرچەندە هەنگاوەکانی سستتر بوون، بەڵام دابڕاو نەبوو لەو شۆڕشەی کە ژیانی ئابووری رۆژئاوای ئەوروپای گرتەوە، بەڵکو لەگەڵ پێشکەوتنی ئامێرەکانی کار و زۆربوونی رێژەی دانیشتوان و فراوانبوونی بازاڕدا تادەهات زەوییە کشتوکاڵییەکان فراوانتر دەبوون و شێوازی پێشکەوتووتر لە بەکارهێنانی زەویدا دەردەکەوت و بەرهەمهێنان زۆرتر دەبوو [41].

لەگەڵ ئەم پێشکەوتنانەدا هێدی هێدی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری مۆرکی بازرگانی وەردەگرت و ناوچە جیاجیاکان بە پێی بازاڕەکانی تایبەت مەنددەبوون، بۆ نموونە ناوچەی هۆڵەندا هەر زوو بە بەرهەمەکانی شیر و ماست ناوبانگی دەرکرد[42]، چەند ناوچەیەکی ئیسپانیا و ئینگلستان بە بەرهەمی خوری بەناوبانگ بوون، تایبەت ئینگلستان لە رێی (پرۆسەی پەرژین —Enclosure) ەوە زۆربەی زەوییەکانی بۆ بەخێوکردنی مەڕ و مالآت تەرخانکردبوو، بەجۆرە جووتیارەکان لە زەوییەکان وەدەردەنران و زەوییەکانیش بۆ بەخێوکردنی مەڕ و مالآت پەرژین دەکران، تایبەت لە کۆتایی سەدەی پازدەدا گەیشتە لوتکە، دوای دەرکەوتنی پیشەسازی رستن و چنین لە ئینگلستان و بەرزبوونەوەی بەهای خوری[43].

پێشکەوتنی بەرهەمە پیشەگەری و کشتوکاڵییەکان و تایبەتمەندبوونی ناوچە جیاجیاکان هێندەی تر چالاکییە بازرگانییەکانی فراوانتر کرد، بۆ نموونە خوری لە ئینگلستانەوە دەچوو بۆ فلاندرز و لەوێوە دەبرایە فلۆرەنسا، دواتر دەکرایە کوتاڵ و بە ناوچەکانی تردا بلاّودەکرایەوە[44]، لە هەمانکاتدا بازرگانی دەرەکی، تایبەت لەگەڵ رۆژهەلاّتدا تادەهات

---

(40) Denys Hay, Europe in Fourteenth..., PP. 385-386; William Gilbert, Renaissance and Reformation, Ch11. www.vlib-iue.it/carrie/texts/carrie-books/gilbert.

(٤١) ادوارد بروي وآخرون، تاريخ الحضارات العام (القرون الوسطى)، ترجمة يوسف اسعد داغر و فريد م. داغر، المجلد الثالث، بيروت، ٢٠٠٣، ص٢٩٦-٢٩٩

Daniel Waley, Latter Medieval Europe. From Saint Louis to Luther, Longman, London, 1964, P. 96.

(٤٢) عرض اقتصادي تاريخي"، المصدر السابق، ص٢٦٩.

(43) J.D. Mackie, The Earlier Tudors (1485 – 1558), Oxford, 1966, PP. 448-450.

(44) Dana Carlton Munro and Raymond James Sontag, The Middle Ages (395-1500), New York and London, 1928, P. 477.

فراوانتر دەبوو، بەمەش لە سەدەی چواردە بەدواوە تەواوی دەریای ناوەڕاست و دەریای رەش و دەریای باکووری بەلتیك بوون بە شانۆی جموجۆڵێکی بازرگانی فراوان[٤٥] و چەندین شاری وەك (بۆرجیز – Burgess) لە فلاندرز و (فرانکفۆرت – Frankfort) لە ئەڵمانیا بوونە ناوەندی بەیەکگەیشتنی بازرگانییە گشتییەکان و چەندین بەندەری وەك لەندەن لە ئینگلستان و (پیزا – Pisa) و (جەنەوا – Genoa) و ڤینیسیا لە ئیتالیا دەرکەوتن[٤٦]. هەروەها (کۆمەڵەی هانسی – Haneastic Legue) کە لە نێوان شارەکانی باکوور و ناوەڕاستی ئەڵمانیا دەرکەوت، بازرگانی رۆژهەلاتی لە کەنارەکانی بەلتیکەوە بەرەو ناوچەکانی تری رۆژئاوای ئەوروپا قۆرغکرد[٤٧].

لەسەرەتای سەدەی پازدە بە دواوە بەرهەمهێنان بە رادەیەك گەشەیسەند کە رۆژ لە دوای رۆژ پێویستی بە بازاڕی نوێتر و بەرفراوانتر دەبوو، لەهەمانکاتدا زێڕ لە ئەنجامی بەکارهێنانی لە چەندین بواری جیاجیادا، بەتایبەتی دراو، تادەهات بەهادارتر دەبوو، هەروەها بەرهەمە رۆژهەلاتییەکان کە لە چەندین بواری ژیانی رۆژئاوادا بەکاردەهاتن تادەهات پێویستتر دەبوون[٤٨]، بۆیە بازرگانی لەگەڵ رۆژهەلاتدا بووە رەگەزێکی سەرەکی بەردەوامی رەوتی گەشەسەندنی ژیانی ئابووری رۆژئاوا، بەلام دەرکەوتنی عوسمانییەکان لەو کاتەدا و هەلکشانیان بەرەو ناوچەکانی ئەوروپا وەردە وەردە رێگا بازرگانییەکانی بەرتەسك دەکردەوە، تایبەت دوای داگیرکردنی (کوستەنتینۆپل – ئەستەمبۆڵ) ساڵی (١٤٥٣ز) و داخستنی تەواوی رێگا بازرگانییەکان بە درێژایی دۆڵی دانوب، بەمەش لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدەوە رێگای میسر و سوریا لە رێی ڤینیسیاوە بوو بە تاکە رێگای بازرگانی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا و

---

(45) Henri Pirenne, Economics and Social History of Medieval Europe, 5th Impression, London, 1953, PP. 192 – 193.

(46) E.H. Dance, New Europe and the New World (Sixteenth to Eighteenth Centuries), London, New York and Toronto, 1951, P. 11.

(47) H.W. C. Davis, Medieval Europe, Oxford University Press, London, New York and Toronto, 1948, P. 187.

(٤٨) كمال مظهر أحمد، محاضرات في تأريخ أوروبا الحديث، معد للطبع ، ص١٢٨؛ عبدالقادر يوسف الجبوري، التأريخ الاقتصادي، من مطبوعات وزارة التعليم العالي و البحث العلمي، جامعة الموصل، ١٩٨٠ ، ص ٨٩.

کەوتە ژێر باجێکی قورسی مەمالیك و قۆرغکاری ئیتالییەکان[٤٩]، بۆیە لەو رۆژگارەدا ولاّتانی رۆژئاوای ئەورووپا لە لوتکەی تامەزرۆییدا بوون بۆ دۆزینەوەی رێگایەکی راستەوخۆ لەگەڵ رۆژهەلاّتدا و رزگاربوون لەو قۆرغکارییە[٥٠].

ئەم رەوشە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە کۆبوونەوەی زانیارییەکی زۆر دەربارەی رۆژهەلاّت لای رۆژئاواییەکان لە رێی میسیۆنێر و گەڕیدە و بازرگانەکانەوە و پێشکەوتنی زانستی جوگرافیا و فەلەك و راستکردنەوەی چەندین هەڵە و کەموکورتی زانستی لەم بوارانەدا، تایبەت لە سەردەمی رێنێسانسدا و پێشکەوتنی پیشەسازی کەشتی و دەرکەوتنی ئامێری نوێ لە بواری کەشتیوانیدا بوون بە هاندەر و رێخۆشکەری دەرکەوتنی بزووتنەوەی دۆزینەوە جوگرافییەکان[٥١]، کە گەشەسەندنێکی گەورەی بەسەر ژیانی ئابووری و کۆمەلاّیەتی رۆژئاوای ئەورووپادا هێنا.

هەنگاوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدەوە لە پورتوگالەوە دەستیپێکرد و ساڵی (١٤٨٨ز) (بارتلۆمیۆدیاز – Bartholomew Diaz) گەیشتە (لوتکەی ئاواتە باشەکان – The Cape of good hope) (رأس الرجاء الصالح) دواتریش لەژێر ئالاّی ئیسپانییەکاندا لە ساڵی (١٤٩٢ز) دا کەشتیوانی جەنەوایی (کریستۆفر کۆلۆمبۆس – Christopher Columbus) گەیشتە خاکی ئەمریکا و لەسەرەتای سەدەی شازدەوە هەریەك لە هۆڵەندا و ئینگلستان و فەرەنسا دەستیان بەگەشتەکانیان کرد[٥٢].

---

(49) Thomas M. Lindsay, Op.Cit., P. 85; "The Cambridge Modern History", Vo.1, P.502.

(50) Emma Peter Smith and Others, World History (The Struggle for Civilization), Ginn and Company, 1946, P. 211.

(٥١) بۆ زانیاری پتر بڕوانە:

J.R. S. Phillips, The Medieval Expansion, 2nd Edition, Oxford, 1998, PP.177-190 ; W.T. Waugh,A History of Europe from 1378 to 1494, 3rd Edition, London, 1949, PP.503-505.

(٥٢) بۆ زانیاری پتر بڕوانە :

Smith and Others, Op.Cit., PP.209-211; J.H Carlton Hayes,A Political and Cultural History of Modern Europe (1500-1830), Vol.1, New York, 1937, PP. 71-75.

زیادبوون و کەڵەکەبوونی سەروەت و سامانێکی گەورە لە رۆژئاوای ئەوروپا لە ئەنجامی تالانکردنی ناوچە دۆزراوەکان و ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کە بازرگانی دەریایی و جیهانی بەخۆیەوەبینی، وەرچەرخانێکی گەورەی بەسەر ژیانی ئابووری ئەوروپادا هێنا و بازرگانی هەنگاوی گەورەی نا و کۆمپانیا بازرگانییەکان و بازرگانی جیهانی دەرکەوتن[٥٣] و بەندەرەکان فراوانبوونێکی گەورەیان بەخۆوەبینی، تەنانەت لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەدا ناوچەی (ئینتۆرپ – Antorp) لە هۆڵەندا بوو بە گەورەترین ناوەند و کۆگای بازرگانی جیهانی و رۆژانە (٤٠٠) کەشتی روویان لە کەنارەکانی دەکرد و پتر لە (١٠٠٠) بازرگانی بیانی لەوێ کۆدەبوونەوە[٥٤]، هاوکات لەگەڵ فراوانبوونی بازاڕەکان و پێشکەوتنی ئامێرەکانی کاردا بەرهەمهێنانی پیشەسازی ئاڵۆزتر و فراوانتر دەبوو بە جۆرێك لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەدا (دووکانی پیشەگەری – Work Shop)[٥٥] کە چەند سەدەیەك بناغەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی بوو، توانای دابینکردنی داواکارییە نوێیەکانی لەدەستدا و هێدی هێدی بوونە بناغەی ماددی بۆ دەرکەوتنی (مانیفاکتۆرە) کە سەرەتای هەنگاوەکانی کارگە و دەرکەوتنی بەرهەمهێنانی پیشەسازیی بوو لەسەر بنەمای دابەشکردنی کار لە نێو چەند کرێکارێکدا و هەنگاوی یەکەمی وەرچەرخانی سەرمایەی بازرگانی بوو بۆ سەرمایەی پیشەسازی، بەمجۆرەش لە سەرەتای سەدەی شازدە بەدواوە پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان تەواوی چالاکییەکانی ژیانی ئابووری کۆمەڵگای رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپای گرتەوە.

---

(53) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, P. 85; فيليسيان شالاي، تاريخ الملكية، ترجمة صباح كنعان، منشورات عويدات، بيروت، ١٩٧٣، ص ٦٦.

(54) Hayes, Modern Europe…, PP. 85-86.

(٥٥) دووکانی پیشەگەری – لەسەرچاوە عەرەبییەکاندا (حوانيت يان المحلات الحرفية) بەکارهاتووە، شێوازێکی بەرهەمهێنان بوو کە لە دووکانێکدا چەند شاگردێك لەژێر دەستی وەستایەك کاریان دەکرد و پرۆسەیەکی ساکارتر بوو لە مانیفاکتۆرە، ئەم شێوەیە لەبەرهەمهێنانی پیشەگەری لە قۆناغێکی پێشکەوتووی سەردەمی دەرەبەگایەتیدا دەرکەوت و چەند سەدەیەك بووە بناغەی پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیشەگەری لە رۆژئاوای ئەوروپا. بڕوانە: Ernst Breisach, Op. Cit., PP. 18-20.

## تەوەرەی دووەم: گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی

شانبەشانی گەشەسەندنە ئابوورییەکان تەوژمی گۆڕانکاری تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕۆژئاوای ئەورووپای گرتەوە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان لە هەناوی پەیوەندییە کۆنەکانەوە دەرکەوتن.

لەڕووی دیمۆگرافییەوە زۆربوونی ڕێژەی دانیشتووان چەندە هۆکاری گەشەسەندنە ئابوورییەکان بوو هێندەش ئەنجامێك بوو بۆ ئەو گەشەسەندنانە، ئەو ڕێژەیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە گەشەدابوو هەرچەندە لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەدا ژمارەی دانیشتووان لە ئەنجامی شەڕ و شۆڕە بەردەوام و مەرگەساتەکاندا، تایبەت مەرگی ڕەش (Black Death)[٥٦] بە شێوەیەکی ترسناك کەمبووەوە، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدە بەدواوە جارێکی تر ئەم ڕێژەیە زیادیکردەوە، تەنانەت لە سەرەتای سەدەی شازدەدا ژمارەی دانیشتووانی چەندین شاری وەك ناپۆلی و میلان و پاریس پتر لە (١٠٠) هەزار کەس دەبوو[٥٧].

سەرەتای سەدە نێوەنجییەکان کاتێك کشتوکاڵ و زەوی سەرچاوەی سەرەکی ژیان بوون، کۆمەڵگا لە دوو چینی سەرەکی پێکدەهات کە بریتیبوون لە چینی (خاوەن زەوی – دەرەبەگ) (لۆرد، سوارە، ئەکلیرۆس .. هتد) و چینی (کۆیلەی زەوی – serf – القن)، ئەو جووتیارانەی کە بە خاووخێزانەوە پابەندی ئەو زەوییانە بوون، کە کاریان تێیدا دەکرد و لە ژیانێکی نیمچە ئازاد و نیمچە کۆیلەدا دەژیان و ئازاد نەبوون لە بەجێهێشتنی زەوییەکان[٥٨].

بەڵام لەگەڵ گەشەسەندنی ژیانی ئابووری و دەرکەوتنی سەرچاوەی نوێی دابینکردنی بژێوی وەك بازرگانی و پیشەگەری و کاری کرێ، لە شارەکاندا، چین و توێژی نوێ سەریانهەڵدا[٥٩]،

---

(٥٦) مەرگی ڕەش (الوباء الاسود) گەورەترین مەرگەسات بوو لە ساڵی (١٣٤٨ – ١٣٤٩) دا ئەورووپای گرتەوە و نزیکەی سێ یەکی دانیشتوانی ئەورووپای لەناوبرد. بڕوانە:
Steven Hase and William Maltby, Essential of Western Civilization. A History of European Society, Vol. 2, P. 217.

(57 ) H.G. Koenigsberger and George L. Mosse, Europe in the Sixteenth Century, 2nd Impression, Longmans, London and Harlow, 1969, PP. 28-29.

(58 ) Hays, A Political…, P. 47; Edward Raymond Turner, Op. Cit., P. 16.

جیمز آ. کوریك، قرون وسطای پسین، ترجمة مهدي حقيقت خوا، تهران، ١٣٨٣ هەتاوی، ل٢٥؛ James Westfall Thomson, Op. Cit., P. 6.

هەر لە سەدەی سێزدەوە دانیشتوانی شار بۆ جیاوازی پێگەی ئابووریيان بە (بۆرجواز - Burghers)[٦٠] دەناسران و بوونە هێزێکی کۆمەڵایەتی کاریگەر لە رەوتی رووداوە کۆمەڵایەتییەکان و بناغەی پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگای سەرمایەدارییان دانا.

بازار و بازرگانی پەیوەندی نێوان شار و گوندی توند و تۆڵ کرد و گوندنشینەکانی لە ژیانی شار ئاگادار کرد و ئازادی کار و ژیان و دەرفەتی کار لە شارەکاندا رۆژ بە رۆژ رێژەی کۆچکردووانی لە گوندەوە بۆ شار زۆرتر دەکرد لە پێناو رزگاربوون لە کۆت و بەندی دەرەبەگەکان، تایبەت دوای دەرچوونی ئەو بڕیارەی دەڵێت: "هەر جووتیارێك بۆ ماوەی ساڵێك و یەك رۆژ لە ئاغاکەی ونبێت مافی ئازادبوونی هەیە"[٦١].

ئەم رەوشە جگە لەوەی دەستی کاری کشتوکاڵی لە گوندەکاندا کەمکردەوە، هاوکات رێژەی بەکاربەرانی لە شارەکاندا پتر و بەهای بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی زۆرتر کرد، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە دەرکەوتنی دراو کە تادەهات لە رێکخستنی پەیوەندییە ئابوورییە نوێیەکاندا بایەخدارتر دەبوو و دەرەبەگەکان بۆ دابینکردنی پێویستییە نوێیەکان پتر پێویستییان پێدەبوو، ئەویش رۆژ لە دوای رۆژ دەرەبەگەکانی ناچاردەکرد کە دەستبەرداری زۆرێك لە بەرژەوەندییەکانیان بن[٦٢] و مل بۆ کرێی دراو بدەن و سیستەمی بەکرێدانی زەوی دەرکەوێت و هێدی هێدی سیستەمی بێگار و سەرانەی بەشە بەرهەم (الريع العيني) بەرەو

---

(٦٠) بۆرجواز، لە وشەی (Burg) ی لاتینییەوە هاتووە کە مانای بورجنشین یا شورانشین دەگەیەنێت. ئەم چینە نە کۆیلەی زەوی و نە جەنگاوەری خانەدانەکان بوون، بەڵکو توێژێکی نوێ بوون کە پشتیان بە بازرگانی و پیشەگەری دەبەست لە دابینکردنی بژێوی ژیان، ئەم چینە لە لایەن خانەدانەکانەوە بە چاوی سوکەوە تەماشادەکران، وکڵێساش بەچاوی گومانەوە سەیریدەکردن، بەڵام لە رێی زیادبوونی بەردەوامی پێگەی ئابوورییانەوە تادەهات پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسییان بەهێز دەبوو، سەرەنجام توانییان کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی لەبەریەکهەڵوەشێنن، ئەم چینە لە فەرەنسا بە چینی ناوەڕاست ناوەزەد دەکران. بڕوانە: Ferguson and Bruun Op. Cit., P. 238 هەرچەندە ئەم زاراوەیە سەرەتا بۆ سەرجەم شارنشینەکان بەکاردەهات، بەڵام دواجار تەنها بوو بە ناوی دەوڵەمەندترین چینی کۆمەڵگای سەرمایەداری. بڕوانە: کمال مظهر احمد، محاضرات ....، ص١٧.

(61) R. H. C. Davis, A History of Medival. From Constantine to Saint Louis, Longman, London, 1970, P.393.

(62) Z. N. Brooke, A History of Europe from 911 to 1198, 3rd Edition, London, 1951, P. 409; Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 321.

نەمان بچن، کە ئەمەش بۆ خۆی مانای هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلەی زەوی دەبەخشێت[٦٣].

لەلایەکی تریشەوە هەر ئەم پرۆسەیە هەنگاوەکانی کامڵبوونی پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگای سەرمایەداری و پرۆسەی سەرەتایی کەڵەکەبوونی سەرمایەی خێراتر کرد، بەو پێیەی ئەوانەی روویاندەکردە شارەکان، هۆیەکانی بەرهەمهێنانیان لەدەستدەدا و دەبوونە کرێکار لای خاوەن مانیفاکتۆرە و بازرگانەکان، بەمەش جگە لەوەی کە بوونە ماکی چینی کرێکار رۆڵێکی گەورەشیان لە کەڵەکەبوونی سەروەت و سامانی چینی بۆرجوازیدا بینی[٦٤]، بەمجۆرەش لە سەرەتای سەدەی شازدە بەدواوە لە رۆژئاوای ئەوروپا شێوەی سەرەتایی پێکهاتەی چینایەتی سیستەمی سەرمایەداری کە لە (کرێکار و سەرمایەدار) پێکدێت دەرکەوت، تایبەت لە ئینگلستان کە پرۆسەی پەرژین رۆڵێکی گەورەی هەبوو[٦٥].

### تەوەرەی سێیەم: گەشەسەندنی فیکر و رێنێسانس

بە هەرەسی سیاسیی و ئابووری ئیمپراتۆریای رۆمانی لە بەشی رۆژئاوادا بەتەواوی کۆڵەگەی ژیانی فیکری و رۆشنبیری تێکشکا و کڵێسا و پیاوانی ئایینی سەرلەبەری پرۆسەی فێربوون و ژیانی فیکری و مەعریفییان پاوانکرد[٦٦]، بەڵام بە گەشەسەندنی ژیانی ئابووری و بوژانەوەی شارەکان و زیادبوونی رێژەی دانیشتووان پرۆسەی فێربوون و ژیانی فیکریش بوژانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوەبینی، فێربوون و خوێندن لە دێرە دوورەکانەوە روویکردە کاتدرائیییەکان لەشار[٦٧]، دواتر قوتابخانەکان لە ژێر باڵی کڵێسادا دەرکەوتن و تادەهات لەگەڵ

---

(63 ) Hayes, Modern Europe…, P. 79.

(٦٤) "عرض اقتصادي تاريخي"، المصدر السابق، ص ٢٧٠.

(٦٥) پرۆسەی پەرژین، لە دوولاوە خزمەتی بە پرۆسەی سەرەتایی کەڵەکەبوونی سەرمایە کرد، لە لایەک بەوەدەرنانی جووتیاران لە زەوییەکان و بوونی زەوییەکانیش بە موڵکی ژمارەیەکی کەم لە موڵکداران، لە لایەکی تریشەوە ئەم جووتیارانە کە هۆیە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانیان (زەوی) لەدەستدەدا بە ناچاری لە مانیفاکتۆرە رستن و چنینەکاندا بەکرێیەکی کەم کاریاندەکرد، بڕوانە: فاضل الحسب ، التاريخ الاقتصادي ، الجزء الثاني ، جامعة بغداد، كلية الادارة والاقتصاد، ١٩٨٦-١٩٨٧، ص ٨٣.

(٦٦) بڕوانە: ج. كرامپ و أ. جاكوب، تراث العصور الوسطى، مراجعة و ترجمة محمد بدران ومحمد مصطفى زيادة، الجزء الاول، مؤسسة سجل العرب، ١٩٦٥، ص ٣٦١-٣٦٢؛ Z.N. Brook, Op. Cit., P. 379.

(٦٧) ادوارد بروي، تاريخ الحضارات العام (القرون الوسطى)، ص٣٢٤.

زیادبوونی ڕێژەی قوتابی و مامۆستاکاندا فراوانتر دەبوون تا دواجار لەسەرەتای سەدەی سێزدەدا (زانکۆ – University)[٦٨] وەك ڕەنگدانەوەیەك بۆ ئەو ڕەوشە ئابووری و کۆمەلآیەتی و فیکرییە لە ژێر سایە و دەسەلآتی کلێسادا دەرکەوت و پەیتاپەیتا لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە فراوان دەبوو و بەشارەکانی ئەورووپادا بلآودەبووەوە[٦٩].

لە ئەنجامی ئەو ڕەوشەی باسکرا لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە بەدیکردنەوەی فیکری کلاسیکی (گریك و ڕۆم) تایبەت (پلاتۆن و ئەریستۆتالیس)، هەروەها ئاشنابوون بە بەرهەمی بیریارە ئیسلامییەکان لە ڕۆژئاوای ئەورووپا لە ڕێی ڕۆژهەلآتەوە (تایبەت ئیسلامییەکان) پتر دوای جەنگی خاچپەرستان تادەهات پرسە فیکری و فەلسەفییەکان گەشەیان دەکرد[٧٠]، لە بەرانبەریشدا هەولدانی کلێسا و پیاوانی ئایینی چڕتر دەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێشهاتە فیکرییەکان، بۆ ئەوەی لە دونیای ئاییندا شوێنێك بۆ عەقلّ بکەنەوە، بۆیە تەواوی کارە فەلسەفییەکانی سەدە نێوەنجییەکان کە لەسەر دەستی (سکۆلاستییەکان – Scholastic)[٧١] لە سەدەی نۆیەم بە دواوە دەرکەوت لە پێناو گونجاندنی ئایینی مەسیحی بوو لەگەلّ فیکری

---

(٦٨) زانکۆ لە کۆتایی سەدەی دوازدە و سەرەتای سەدەی سێزدەدا دەرکەوت، سەرەتا لە پۆلۆنیا و ئیتالیا و فەرەنسا دەرکەوتن و دواتریش بە ناوچەکانی تردا بلآوبووەوە، بەر لە سالّی (١٥٠٠ز) نزیکەی (٨٠) زانکۆ لە شارەکانی ڕۆژئاوای ئەورووپا دامەزرابوو. وشەی (Universities) وشەیەکی لاتینییە، بە مانای کۆمەلّە یان یەکێتی دێت و لەسەدە نێوەنجییەکاندا سەرەتا بۆ هەموو جۆرە کۆمەلّە و یەکێتییەك بەکاردەهات، بەلآم بەتێپەڕبوونی کات تایبەت بوو تەنها بە کۆمەلّەی مامۆستا و قوتابییان. گرنگترین پسپۆڕییەکانی ئەو کاتە بریتیبوون لە تیۆلۆجیا و فەلسەفە و پزیشکی و یاسا. بڕوانە:سعید عبدالفتاح عاشور، أوروبا العصور الوسطی (النهضات والحضارة والنظم)، الجزء الثاني، مکتبة الانجلو مصرية، دار وهدان، القاهرة، ١٩٨٧، ص ٣٤٢-٣٥٠ .
(٦٨) وهيب ابراهيم سمعان، الثقافة والتربية في العصور الوسطی. دراسة تاريخية مقارنة، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٦٢، ص١٧٥.

(٦٩) يوسف کرم، تاريخ الفلسفة الاوروبية في العصر الوسيط، دار المعارف بمصر، القاهرة، د.ت.، ص٣.
(٧١) سکۆلاستییەکان : ئەم ناوە لە(School) ەوە هاتووە و بۆ ئەو شێوازی فێربوون و کارە فیکرییانە بەکاردێت کە لە سەدەی دەیەم بە دواوە لە قوتابخانەکانی کلێسا و زانکۆکانی ئەورووپا دەرکەوت و تا سەدەی حەڤدە بەردەوامی هەبوو و ئامانجی گونجاندنی عەقلّ و ئاین بوو. بڕوانە: جميل صليبا، المعجم الفلسفي للالفاظ العربية والفرنسية والانکليزية واللاتينية، الجزء الثاني، دار الکتاب اللبناني، بيروت، ١٩٧١، ص ٣٥٩؛ جورج طرابيشي، معجم الفلاسفة (الفلاسفة-المناطقة-المتکلمون-اللاهوتيون-المتصوفون)، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٧، ص٢١٧.

فەلسەفی و لە کۆتایی سەدەی سێزدەدا بە هەوڵەکانی (تۆماس ئەکیۆنس – Thomas Aquines)[٧٢] بۆ گونجاندنی فیکری ئەرستۆتالیس و ئایینی مەسیحی گەیشتە لوتکە و دواتریش لە سەرەتای سەدەی چواردەدا لەسەر دەستی (ولیام ئۆکهامی - William Okham) کۆتایهات بـــەوەی بـــــە تەواوی بوارەکانی فیکری و ئایینی لێك جیاکردەوە:[٧٣]

هەرچەندە ئەم چەشنە بیرکردنەوەیە تا دوادوایی سەدە نێوەنجییەکان بە پشتیوانی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانەوە بڕیکرد، بەڵام گەشەسەندنی ژیانی ئابووری و فراوانبوونی خۆشگوزەرانی و پێشکەوتنی بازرگانی و پیشەگەری تادەهات پێویستییان بە زانست و زانیاری نوێتر دەبوو، دەرکەوتنی چین و توێژی نوێ و پەیوەندییە نوێیەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەیوەندییە کۆنەکان و پێکهاتە فیکرییەکانی بەرەو پووکانەوە دەبرد و کۆمەڵگای ئامەزرۆی چەشنێکی نوێی بیرکردنەوە دەکرد کە لەگەڵ ڕەوشی نوێی ژیاندا بگونجێت[٧٤].

وێڕای ئەوەی تادەهات خوێندەواری و ڕۆشنبیری بە نێو چین و توێژە جیاجیاکاندا تەشەنەیدەکرد و سنووری پیاوانی کڵێسای تێکدەشکاند، ئەمانە لە کاتێکدا بوون کە ڕۆژئاوای ئەوروپا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر بە فیکر و کەلتووری کلاسیکی (گریك و ڕۆم)[٧٥] ئاشنادەبوون لە ڕێی ڕۆژهەلاتەوە، کە بە تاکە وەلامدەرەوەی ویستە فیکرییەکانی ئەو ڕۆژگارەیان دەزانی و ڕۆشنبیری سەدە نێوەنجییەکان لە ئاستیدا دەستەوەستان بووبوون، بۆیە

---

(٧٢) تۆماس ئەکیۆنس (١٢٢٧ – ١٢٧٤ز) یەکێك بوو لە گەورەترین بیریارەکانی سەردەمی خۆی، سەر بە دۆمەنیکانییەکان بوو، بە زۆری کەوتبووە ژێر کاریگەری هزری ئەرستۆتالیس (پوختەی تیۆلۆجیا Suma – Thologica)بە ناوبانگترین بەرهەمەکانی بوو، بڕوانە:

George Fox Mott and Harold M. Dee, An Outline History of the Middle Ages, 3rd Edition, Barnes and Noble, New York, 1949, P. 168.

(٧٣) عبدالمنعم الحفني، موسوعة الفلسفة والفلاسفة، الجزء الثاني، الطبعة الثانية، دار مدبولي للنشر، القاهرة، ١٩٩٩، ص ١٥٣٣- ١٥٣٤. ولیەم ئۆکهامی (١٢٨٥ – ١٣٤٩ز) یەکێك بوو لە راهیبە فەرەنسیسکانییەکان، لەدایکبووی ناوچەی ئۆکهامی نزیك شاری لەندەن بوو، بەناوبانگترین فەیلەسوفی سکۆلاستی سەدەی چواردە بوو و هەر زوو بانگەشەی جیاکردنەوەی ئەرکەکانی فەلسەفە و ئایینی کرد، و داوای جیاکردنەوەی ئاین و سیاسەتی کرد. بڕوانە: عبدالمنعم الحفني، المصدر السابق، ص١٥٣٣-١٥٣٤.

(74) Fredinand Schevill, A History of Europe from the Reformation to the Present Day, New York, 1946, P. 32; Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 324.

(٧٥) لێرەوە ئیدی وشەی (کلاسیك) لە بری فەلسەفەی کلاسیکی گریك و ڕۆم بەکاردێنین.

لەوکاتەدا کۆمەڵگا چەندە بەخەم شێوازێکی نوێی بیرکردنەوە بوو هێندەش لە فیکر و ڕۆشنبیری سەدە نێوەنجییەکان بێزار بووبوو کە بەرهەمی چەندسەد ساڵەی دەستی کڵێسا بوون[٧٦]، بۆیە ڕێنێسانس بە یاخیبوون لەم ڕۆشنبیرییە دەستیپێکرد و زیندووکردنەوەی کەلتووری کلاسیکی کردە سەرچاوەی کارەکانی و تەنانەت ناوی ئەم بزووتنەوەیە لە وشەی (Renaissance)ی فەرەنسییەوە هاتووە بە مانای (زیندووکردنەوە - ژیانەوە) دێت و ئاماژە بە زیندووکردنەوەی کەلتووری کلاسیك دەکات[٧٧].

شارە دەوڵەمەندەکانی ئیتالیا کە بەر لە هەموو ناوچەکانی تری ئەوروپا پەیوەندییە سەرمایەدارییەکانیان تێیدا دەرکەوت و گەورەترین ناوەندی شارستانییەتی گریك و ڕۆم بوون و هیچ کاتێك بەیەکجاری لەم شارستانییەتە دانەبڕابوون[٧٨]، بوونە لانکەی دەرکەوتنی بزووتنەوەی ڕێنێسانس و کۆتایی سەدەی چواردە بە ڕوونی هەنگاوە ڕاستەقینەکانی لەوێ دەرکەوتن و پەیتاپەیتا بە گوڕ و تین دەبوون و بەرەو ناوچەکانی تری ئەوروپا پەلیان دەهاوێشت، تایبەت لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدە بە دواوە[٧٩] و دوای داگیرکردنی ئەستەمبوڵ لە لایەن عوسمانییەکانەوە ساڵی (١٤٥٣ز)[٨٠] و ئاوارەبوونی زۆرێك لە زاناکانی

---

(٧٦) بڕوانە: یوهان هویزنجا، اضمحلال العصور الوسطی، ترجمة عبدالعزیز توفیق جاوید، الطبعة الثانیة، الهیئة المصریة العامة للکتاب، القاهرة، ١٩٩٨، ص ٣١٩؛ Schevill, Op. Cit., P. 34.

(77) A. J. Grant, Outline of Europe History, London, New York and Toronto,1941, P.266.

(٧٨) بڕوانە:

Gene. A. Brucker, Renaissance Italy. Was it the Birth Place of the Modern History?, New York, 1958, P.2; "The New Cambridge Modern History", Vol.1, The Renaissance (1493 – 1520), Cambridge University Press, 1967, P. 69; E.M. Jamson and Others, Italy Medival and Modern. A History, Oxford, 1919, P. 133.

(٧٩) بڕوانە: کمال مظهر أحمد، النهضة، منشورات وزارة الثقافة والفنون، بغداد، ١٩٧٩، ص ١٨-٢٠؛ A.J. Grant , Op.Cit., PP. 267-268.

(٨٠) سیدنی دارك کاتێك مەودای ڕێنێسانس دیاریدەکات ئەم ساڵە بە دەستپێکی دەزانێت و مەرگی ئەلیزابێسی شاژنی ئینگلستان لە ساڵی (١٦٠٣ز) دا بە دوماهی هاتنی دادەنێت. بڕوانە: سیدنی دارك، مێژووی ڕێنێسانس، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٣. بەڵام بەلای ئێمەوە ئەمجۆرە دیاریکردنە بۆ ڕووداوێکی وەك ڕێنێسانس نەشیاوە، بەڵکو ئەوجۆرە دیاریکردنە بە زانستی و شیاوتر دەزانین کە کەمال مەزهەر و هەندێکی تر لە مێژوونووسان کردوویانە کە دەڵێن: لە کۆتایی سەدەی چواردەدا

و بەبڕێکی زۆر لە کەلتووری کلاسیکەوە بەرەو ناوچەکانی ئیتالیا[٨١]، هەروەها دەرکەوتنی (چاپەمەنی پیتە بزۆکەکان – الحروف المتحركة) کە وەرچەرخانێکی گەورەی بەسەر پرۆسەی نووسینەوەی کتێبدا هێنا و ڕۆڵێکی گەورەی لە خێراکردنی هەنگاوەکانی ڕێنێسانس و ئاسانکردنی بلاوبوونەوەیدا بینی.

هیومانیستەکان[٨٢]، کە کارەکانیان ڕەگەزی سەرەکی سەردەمی ڕێنێسانس بوو (یەکەم توێژی ڕۆشنبیر بوون لەو سەردەمەدا لە ڕۆژئاوای ئەورووپا کە لە سەرجەم چین و توێژە کۆمەلایەتییەکان پێکدەهاتن و تەنها پیاوانی ئایینی تاکە ڕەگەزی پێکهێنەر نەبوون)[٨٣]، زیندووکردنەوەی کەلتووری کلاسیکیان کردە تاکە سەرچاوەی گێڕانەوەی خەسڵەتە دونیاییەکانی زانست و هونەر و ئەدەب و گەڕان بەدوای مرۆڤایەتی مرۆڤ و سەلماندنی شوێن و پێگەی تاك لە کۆمەڵدا کە چەندین سەدە بوو بیروباوەڕی ئایینی و ڕۆشنبیری کڵێسا فەرامۆشی کردبوون، بۆیە پێداگری لەسەر خودی تاکەکان (تاکگەرایی – Individualism) بووە خەسڵەتێکی سەرەکی ئەم بزووتنەوەیە[٨٤].

هەرچەندە تەواوی کارەکانی ڕێنێسانس هەوڵی زیندووکردنەوەی کلاسیك و دوورکەوتنەوە لە شێوازی سەدە نێوەنجییەکان بوو، بەلام پێشکەوتوویی ئەزموون و داهێنانەکانی ئەو ڕۆژگارە مۆرکێکی تایبەت و شێوازێکی نوێتری بە بەرهەمەکانی ڕێنێسانس بەخشی، بۆ نموونە لە هونەری بیناسازیدا ئەگەرچی بە تەواوی لە شێوازی (غوتی – Quti) دوورکەوتنەوە و گەڕانەوە بۆ کلاسیك، بەلام لە تەواوی شارستانییەتی گریك و ڕۆمدا

---

هەنگاوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بە ڕوونی دەستپێدەکات و لە کۆتایی سەدەی پازدەدا دەگاتە لوتکە و سەدەی شازدەش دەخایەنێت، كمال مظهر أحمد، النهضة، ص١٨-٢٠.

(81) Schevill, Op. Cit., P. 35.

(٨٢) هیومانیزم Humanism - لە وشەی (Humanitas) ی لاتینییەوە هاتووە کە مانای مرۆڤایەتی دەبەخشێ، ئەویش لە وشەی (Homo) وەرگیراوە و بە مانای مرۆڤ دێت. ئەم زاراوەیە لە سەدەی شازدەدا وەك چەمکێکی کۆمەلایەتی و فیکری جێگیر بووە، ئەگەرچی پێشتریش ژمارەیەك لە هیومانیستەکان زۆر جار دەستەواژەی (Humanitas) یان لەبەرهەمەکانیان بەکارهێناوە، بڕوانە: كمال مظهر أحمد، النهضة، ص٣٨.

(83) Palmer, Op. Cit., P. 60.

(٨٤) "عرض اقتصادي تاريخي"، المصدر السابق، ص ٢٨٠؛ عبدالقادر أحمد اليوسف، العصور الوسطى الاوروبية، (٤٧٦ – ١٥٠٠) ، المكتبة العصرية، بيروت ، ١٩٦٧، ص ٣٥٩ – ٣٦٠.

بەرهەمێکی وەك کڵـێسای (سانت. پترۆس) و کۆشکەکانی ڤینیسیا بەدیناکرێت[٨٥] و سەرجەم بەشە هونەرییەکانی تریش بەهەمانشێوە بوون. لەبواری زمان و ئەدەبیشدا هەر زوو رەخنە و توانجی هیومانیستەکان سەروگوێی زمانی لاتینی کڵـێسا (لینجوا فرانکا)یشی گرتەوە کە چەند سەدەیەك بوو تاکە زمانی رۆشنبیری بوو[٨٦]، هەوڵی زیندووکردنەوەی زمانی لاتینی کلاسیکیاندا و لە هەمانکاتدا بەشێکیان زمانە میللییەکانیشیان لەبەرهەمەکانیاندا بەکاردەهێنا، هەرچەندە سەرەتا زۆر بەکەمی بوو بەڵام لە سەرەتای سەدەی شازدە بەدواوە هێدی هێدی زمانە میللییەکان لە تەواوی رۆژئاوای ئەوروپا جگە لە (ناوچەی پاپایی – Papal States)[٨٧] نەبێت شوێنی زمانی لاتینی گرتەوە[٨٨].

ئەمە جگە لەوەی رێنێسانس دەیان دەسکەوتی زانستی گەورەی لە بواری فەلەك و جوگرافیا و کیمیا و پزیشکی و... هتد لێکەوتەوە و چەندین بیرۆکەی لە بواری فەلسەفە و بیری سیاسیی و زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا وروژاند، وێڕای ئەوەی پێشکەوتنێکی بەرچـــاوی بەسەر نووسینەوە و رەخنەی مێژوویـیدا هێنا، کە بـە درۆخستنــەوەی (پەخشی کوستەنتین –

---

(٨٥) کرین برینتون، المصدر السابق، ص٢٥.

(٨٦) بڕوانە: فاروق القاضي، آفاق التمرد. قراءة نقدية في التأريخ الاوروبي و العربي الاسلامي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، القاهرة، ٢٠٠٤، ص ٥٦؛ Palmer, Op. Cit., P. 60.

(٨٧) ئەو ناوچەیە بوو لە ئیتالیا کە راستەوخۆ لەلایەن پاپاوە حوکمڕانی دەکرا دوای ئەوەی لە ساڵی (٧٥٤ز) دا بە فەرمی (پیپن فەرەنکی (Pepin of Franks - بەشی زۆری ناوچەی ناوەڕاستی ئیتالیا بە (پاپا ستیفنی سێیەم (Stephen 3 - بەخشی و لە ساڵی (٧٧٤ز) و لە لایەن پەرلەمانەوە بە تەواوی چەسپی و بەدرێژایی سەدە نێوەنجییەکان ئەم ناوچانە لە ژێر حوکمڕانی پاپاکاندا بوون، ئەگەرچی لە شۆڕشی فەرەنسی (١٧٨٩ز) دا ئەم دەسەڵاتدارییەتییە هەڵوەشایەوە، بەڵام لە کۆنگرەی ڤییەنا (١٨١٥ز) جارێکی تر لە ژێر زێرەڤانی ئەمسا زیندووکرایەوە تا دواجار لە ساڵی (١٩٢٩ز) دا و بەپێی رێککەوتنێکی نێوان پاپا و حکومەتی ئیتالیا تەنها ناوچەی ڤاتیکان لە شاری رۆما بۆ پاپاکان تەرخانکرا. بڕوانە:
"Encyclopedia Internatinal", Vol. 14, Grolier of Canada Limited, U.S.A, 1963, P.50.

(٨٨) بڕوانە: بول ج. رجيرز، فلورنسة في عصر دانتي، ترجمة د.محمود ابراهيم، بيروت–نيويورك، ١٩٦٧،ص٢٠٩؛
Hayes, Modern Europe…, OP. Cit., PP.113-114; Hase and Maltby, Op. Cit., P. 248.

دیارترین کارەکانی ئەم بوارەیە[90]. بەجۆرەش ئەگەرچی زۆرێك لەم زانستانە لە سەدەکانی دواتردا پێگەیشتن، بەڵام رێنێسانس توانی بناغەی پێکهاتەی فیکری و زانستی سەدە نێوەنجییەکان لەبەریەکهەڵوەشێنێت و بناغەی پێکهاتەی فیکری و زانستی نوێ دابڕێژێت.

(Donation of Constntiney)[89] لە لایەن (لۆرینزۆ ڤالا – Lorinzo Valla)وە

کارەکانی رێنێسانس کە بریتیبوون لە گەڕانەوە بۆ فیکر و کەلتووری سەردەمی (پاگانیزم – الوثنیة)ی بەر لە باڵادەستی رۆشنبیری مەسیحی، هەروەها هێرشکردنە سەر کەلتوور و رۆشنبیری سەدە نێوەنجییەکان راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ سەروگوێی کلێسایان گرتەوە، بۆیە بەلای زۆرێك لە بیریارانەوە هەر زوو مۆرکێکی دژەئاینییان وەرگرت، ئەگەرچی ئەم بزووتنەوەیە گۆڕانێکی گەورەی بەسەر ژیانی ئاینیدا هێنا و زۆر لە هەیبەت و دەسەڵاتی کلێسای کەمکردەوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە بزووتنەوەیەکی دژەئاینی بووبێ، چونکە بەشی هەرە زۆری رابەرانی رێنێسانس دینداربوون[91]، ئەوان تەنها رزگارکردنی فیکر لە کۆت و بەندەکانی کلێسا و جیاکردنەوەی بواری عەقڵ و ئاین مەبەستی سەرەکیان بوو.

### تەوەرەی چوارەم: گەشەسەندنی سیاسی

شارەکانی سەدە نێوەنجییەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەرەبەگەکاندا دەرکەوتن و باج و سەرانەیان بۆ ئەوان بوو، بەڵام هێندەی نەبرد دانیشتوانی ئەم شارانە هەستیان بەوەکرد کە مانەوەیان بەو جۆرە پتر لە خزمەتی دەرەبەگەکاندایە نەك بەرژەوەندی خۆیان[92]، بۆیە هەر زوو کەوتنە هەوڵی دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی و لە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەدا بەشی هەرە زۆری

---

(89) پەخشی کوستەنتین ئەو پەخشە بوو کە پاپاکان لە سەدەی هەشتەمدا وەك پشتیوانییەکی مێژوویی بۆ دەسەڵاتی دونیایان دایانهێنابوو گوایە سەدەی چوار کوستەنتین دوای گواستنەوەی پایتەخت لە رۆماوە بۆ (کوستەنتینۆپل) مافی دسەڵاتدارییەتی رۆما و دەوروبەری بە پاپا بەخشیوە. بەڵام لۆرینزۆ ڤالا ئەوەی روونکردەوە کە ئەمە ساختەکارییە و ئەو زمانەی ئەم پەخشەی پێ نووسراوەتەوە زمانی سەدەی چوارەم نییە، بڕوانە : کرین برینتون، المصدر السابق ، ص ٣٤.

(٩٠) بڕوانە: نورالدین حاطوم، تاریخ عصر النهضة الاوربیة، دار الفكر، دمشق، ١٩٨٥، ص ٨٨ – ١٠٠؛ كمال مظهر أحمد،النهضة،ص ٥٢-٦٤؛علي حیدر سلیمان، تاریخ المدینة الاوروبیة الحدیثة،بغداد، د.ت.،ص٣٨-٤٤.

(٩١) یوهان هویزنجا، اضمحلال...، ص ٣١٦ – ٣١٩ ؛ Ferguson and Bruun, Op.Cit., P. 324.

(٩٢) عرض تاریخي اقتصادي"، المصدر السابق، ص٢١٣ ؛ Smith and Others , Op. Cit., P. 196.

شارەکانی رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپا چ لە رێی راپەڕینەوە بووبێت یان رێککەوتن یان بەرانبەر پارە و پول توانییان سەربەخۆیی بەدەســـتبێنن[٩٣]، هەر لەو سەروبەندەشدا لە شارەکاندا (سەندیکا پیشەگەرییەکان – Graft Gild) دەرکەوتن و پرۆسەی بەرهەمهێنان و چاودێریکردنی بازاڕ و نەهێشتنی ململانێی نێوان پیشەگەران[٩٤] و رێکخستنی چەند لایەنێکی کۆمەڵایەتییان گرتە ئەستۆ، جگە لەوەی هەر زوو مۆرکێکی سیاسییان وەرگرت و زۆر جار جڵەوی سیاسیی شارەکانیان دەگرتە دەست[٩٥].

لە لایەکی تریشەوە لە دوادوایی سەدە نێوەنجییەکاندا، دوای ئەوەی میرە دەرەبەگەکان دووچاری رەوشێکی ئابووری دژوار هاتن لە ئەنجامی لەدەستدانی زۆرێك لە بەرژەوەندییەکانیان ، تایبەت دوای دەرکەوتنی ئابووری دراو[٩٦]، بەردەوام لە رێی دابڕینی ناوچەکانیانەوە و سەپاندنی دەسەلاتێکی رەهاوە هەوڵیاندەدا قەرەبووی ئەو زیانانە بکەنەوە، بەمەش تادەهات ویستە جیاخوازییەکانیان بەگوڕتر دەبوو، بەلاّم ئەم رەوشە (ناوچەیی – لۆکاڵ)یەی هەریەك لە شارە سەربەخۆکان و میرەکان لەگەڵ بەرژەوەندی پاشاکاندا یەکیان نەدەگرتەوە[٩٧]، بەمجۆرەش پێکهاتەی سیاسیی رۆژئاوای ئەوروپا لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا شێوەیەکی دوو فاقەیی وەرگرتبوو، لە لایەك دەسەلاتی گشتگیری کلێسا و (ئیمپراتۆریای رۆمانی پیرۆز)[٩٨]، لە

---

(٩٣) بڕوانە: هـ . أ. ل. فشر، تاريخ اوربا العصور الوسطى، ترجمة مصطفى زيادة والسيد باز العريني، الطبعة السادسة، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٧٦، ص ٢٣٣؛ عبدلعظيم رمضان، المصدر السابق، ص ٢٨.

(94) Munro and Sontag, Op. Cit., P. 472.

(95) Ogg, Op. Cit., P. 49; Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol.1, P. 81.

(٩٦) لەم بارەیەوە بڕوانە تەوەرەی گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکان لەم بەشەدا.

(٩٧) بڕوانە: كمال مظهر أحمد، محاضرات ....، ص ٢٥.

(98) (Holy Roman Empire) ئەو قەوارە سیاسییە گشتگیرە بوو کە ساڵی(٨٠٠ز) لە لایەن ساڵی (Otto– چارلەمانەوە لە رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپا دامەزرا و دواتریش لە سەرە دەستی (ئۆتۆ (٩٦٢ز) بە تەواوی جێگیربوو، وەك پارێزەری جیهانی کاتۆلیکی خۆیدەنواند، هەرچەندە سنووری دەسەلاتەکەی تەواوی ئەو ناوچانەی نەگرتەوە و لە ئەڵمانیا و ئیتالیا و بۆرگەندیا و بۆهیمیا و چەند ناوچەیەکی زەوییەنزمەکان تێپەڕی نەکرد، ئەم دەسەلاتەش لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا تەواو لاوازبوو و لە کۆنگرەی ویستیفاڵیای ساڵی (١٦٤٨ز) زۆرێك لە دەسەلاتی یاسایی لەدەستدا، دوا جار لە ساڵی (١٨٠٦ز) و دوای نزیکەی هەزار ساڵ مانەوە لەبەریەکهەڵوەشایەوە. بڕوانە: "Encyclopedia Internatonal" , Vol. 8, P. 482 – 483.

لایەکی تریشەوە دەسەلاتی ناوچەیی هەریەك لە شارە سەربەخۆکان و میرەکان، کە هەریەك لەم دەسەلاتە ناوچەییانە یاسا و ڕێسای تایبەتی هەبوو، باجی خۆیان دەخستە سەر کاروانە بازرگانییەکان، جگە لەوەی لە جەنگی بەردەوامدا بوون لەگەڵ یەکدیدا، کە ڕێگا و بانەکانی دووچاری چەتەگەری و ناارامی کردبوو[٩٩].

ئەم پەرتەوازەییە سیاسییە چەند دژ بە بەرژەوەندی پاشاکان بوو هێندەش ببووە تەگەرەی بەردەم بەرژەوەندی بۆرجوازییەکان و ڕەوتی گەشەسەندنی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان، بۆیە لە ژێر باری ئەم هەلومەرجەدا هەردوولا هاوپەیمانیەتییەکی سیاسییان لە دژی دەسەلاتە ناوچەییەکاندا بەست و بە پشتیوانی توانای ئابووری بۆرجوازییەکان و سوپای تۆکمە و پڕچەکی پاشاکان تایبەت دوای دۆزینەوەی بارود، کەوتنە خەباتێکی سەرکەوتووانە دژ بە دەسەلاتی میرەکان کە پشتیان بەهێزی سوارچاکەکان (نظام الفروسية) و چەکە کۆنەکان دەبەست، بەمەش لە کۆتایی سەدەی پازدە چەند وڵاتێکی وەك فەرەنسا و ئیسپانیا و ئینگلستان دەرکەوتن کە خاوەن دەسەلاتێکی ناوەندی بوون لە ژێر سایەی پاشایەکی بەهێزدا[١٠٠].

بەمجۆرە نەخشەی سیاسیی ڕۆژئاوای ئەورووپا لە سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا بەمشێوەیە پێکدەهات، چەند وڵاتێکی ناوەندی وەك ئینگلستان و فەرەنسا و ئیسپانیا لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە ئیمپراتۆریای ڕۆمانی پیرۆز کە لە چەند دەسەلاتداریەتییەکی سەربەخۆ پێکدەهات هەروەها چەند دەسەلاتێکی سەربەخۆ لە پاڵ دەسەلاتداریەتی پاپایی لە ئیتالیا و چەند دەسەلاتداریەتییەك لە ناوچەکانی ئەسکەندەناڤیا کە لە هەنگاودانانبوون بۆ سەربەخۆیی[١٠١] لە یەکێتی کالمەر (Kalmar Union)[١٠٢].

---

(99) Palmer, Op. Cit., P. 71.

(100) Denys Hay, The Italian Renaissance in its Historical Background, Cambridge, 1968, P.15; Hayes, Mdern Europe…, P. 25.

(101) Hayes, Modern Europe…, P. 33.

(١٠٢) ئەو یەکێتییە بوو کە لەساڵی ١٣٩٧ز بەدواوە، سوید و نەرویج و دانیمارکی لەژێر سایەی یەك پاشادا کۆ کردەوە. ئەم یەکێتییە بەناوی شاری کالمەری سویدییەوە ناونرا کە لەو شارەدا یەکەم پاشای ئەو یەکێتییە هەڵبژێردرا و دواتریش هەر ئەو شارە بوو بە پایتەختی، بەڵام هەر لە سەرەتاوە یەکێتییەکی لاواز بوو، ئەوە بوو لە ساڵی ١٥٢٣ز یەوە سوید جیابوونەوەی خۆی ڕاگەیاند هەریەك لە نەرویج و دانیمارکیش تا ساڵی ١٨١٤ز لە یەکێتییەکی لاوازدا مانەوە. بڕوانە::

"Encyclopedia International", Vol. 10, P. 97.

سەرەنجام دەتوانین بلّێین لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدە و نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەدا لە رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپا هەنگاوەکانی لەبەر یەکهەلّوەشانەوەی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان پێینایە قۆناغی کاملّبوون و پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان دەستیان بە خۆسەپاندن کرد، هەر ئەم مەودا مێژووییەش بووە ماوەی وەرچەرخانی کۆمەلّگا لە سەدە نێوەنجییەکانەوە بۆ سەدە نوێیەکان، بۆیە سەدەی شازدە بووە سەدەی پێکداهەلّپژانی بەرژەوەندییە کۆنەکان بۆ خۆپاراستن و بەرژەوەندییە نوێیەکان بۆ خۆسەلماندن لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا و ئەمەش هەلّچوون و رابوونێکی کۆمەلاّیەتی و سیاسیی گەورەی لێکەوتەوە کە ریفۆرمی ئایینی بە توندوتیژترین شێوە گوزراشتی لێدەکات.

## باسی سێیەم:

# کڵێســـــای کاتۆلیکـــــی

### تەوەرەی یەکەم: بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی

لە نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی زایینیدا لە ویلایەتە رۆژهەڵاتییەکانی ئیمپراتۆریای رۆمانی، ئایینی مەسیحی[(١٠٣)] لەسەر دەستی (یەسوعی کوڕی مەریەم) لە ناوچەی فەلەستین وەك درێژەپێدان و هەوڵی چاکسازی لە ئایینی یەهودی دەرکەوت[(١٠٤)]، دواتریش لەسەر دەستی (سانت. پۆڵ)، کە یەکێك بوو لە چالاکترین دوازدە نێردراوەکەی دوای مەسیح ئەم ئایینە لە قاڵبی ئایینی یەهودی چووەدەر و بووە ئایینێکی جیهانی و گشتگیر[(١٠٥)] و بەرەو ناوچە رۆژئاواییەکان تەشەنەیکرد و توانی لە رێی بێبەهاکردنی ژیانی ئەم دونیا و چاوەڕوانی ئەو

---

(١٠٣) وشەی مەسیحی لە وشەی Moshia یان Messiah ی عیبرییەوە هاتووە بە مانای سڕینەوە بە رۆن و بۆ شوێنکەوتووانی مەسیح بەکاردێت. بڕوانە :

Wikipedia, The Free Encyclopedia

(Christianity).www.wikipededi.org/wiki/Christianity.

ئەم وشەیە لەسەردەمی مەسیحدا بەکارنەهاتووە، بەڵکو لە سەردەمی (سانت. پۆڵ)ەوە بەکاردێت. بڕوانە:

أحمد شلبي، مقارنة الاديان. المسيحية، الجزء الثاني ، الطبعة العاشرة، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٩٨، ص٩٤.

(١٠٤) برتراند رسل، تاريخ الفلسفة الغربية. الفلسفة الكاثوليكية ، ترجمة زكي نجيب محمود، مراجعة أحمد أمين، الجزء الثاني، د.م.، د.ت.، ص٣٦ ؛ نورالدين حاطوم، تاريخ العصر الوسيط في أوربة، الجزء الاول، دار الفكر، دمشق، ١٩٦٧، ص ٦٢ - ٦٣.

(١٠٥) وفاء فرحات، "موسوعة الاديان. الديانة المسيحية (كاثوليك- الارذثوذكس- البروتستانت-الموارنة)"، دار اليوسف، بيروت ، ٢٠٠٤، ص ١٩؛ عبده فراج، معالم الفكر الفلسفي في العصور الوسطى (فلسفة اسلامية ومسيحية)، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٦٩، ص ١٧.

دونیا و پشتگیریکردنی هەژاران و پرەنسیپە یەکسانیخوازییەکانییەوە ببێتە دابینکەری ویست و خواستی فیکری و رۆحی تێکشکاوی ئەو رۆژگارەی کۆمەڵگای رۆمانی[١٠٦] و ستەملێکراوان بە دەوری خۆیدا کۆبکاتەوە و بە خێرایی بەنێو چینی هەژار و کۆیلەدا بڵاوببێتەوە، دواتریش بەنێو چین و توێژاڵەکانی تردا تەشەنەبکات[١٠٧] بەجۆرێك لەسەرەتای سەدەی چواردا لایەنگری لە لایەنگرانی سەرجەم ئایینەکانی تری ئیمپراتۆریای رۆمانی زۆرتر بوو[١٠٨].

ئایینی مەسیحی هەرچەندە سەرەتا خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی دەسەڵات دەبوارد، بەڵام بەشداری نەکردنی بڕوادارانی لە سوپا و رەتکردنەوەی سەرجەم ئایینەکان و نەپەرستنی ئیمپراتۆر و رەخنەگرتن لە تەواوی پێکهاتەی ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کۆیلایەتی رۆمانی، هەر زوو مۆرکی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی ریشەیی بەم ئایینە بەخشی و ترسێکی گەورەی لای دەسەڵاتداران دروستکرد[١٠٩]، بۆیە هەر لەسەردەمی ئیمپراتۆر (نیرۆن — Niron) (54-68ز)ەوە کەوتنە بەر هەڵمەتی ستەمکاری کە لەسەردەمی ئیمپراتۆر (دۆکلیاتین — Diocletian) (305 – 384ز) گەیشتە لوتکەی توندوتیژی، بۆیە لای مەسیحییەکان سەردەمی ئەم ئیمپراتۆرە بە سەردەمی شەهیدان ناسراوە[١١٠]، بەڵام بێئەوەی ئەم ستەمکارییە بتوانێت بەر بە بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە بگرێت و لە دڵسۆزی هەوادارانی کەمبکاتەوە،

---

(١٠٦) لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەم بەدواوە هەرەسی ژیانی ئابووری و ئاشوبە سیاسییەکان و شکستی بەردەوامی راپەڕینی کۆیلەکان بە تەواوی کۆمەڵگایان تامەزرۆی ئەمجۆرە بیرکرنەوەیە کرد. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عبده فراج، المصدر السابق، ص ١٧؛ هـ. سانت موس، میلاد العصور الوسطى، ترجمة عبدالعزیز توفیق جاوید، مراجعة د. السید الباز العریني، الهیئة المصریة العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٨، ص ١٥-٢٦؛ A. J. Grant, Op. Cit., P. 107.

(١٠٧) منصور المخلصي، الكنیسة عبر التاریخ، كلیة الفلسفة واللاهوت، بغداد، ١٩٩٧، ص ١٣.

(١٠٨) احمد شلبي، المصدر السابق، ص ٩٥.

(١٠٩) بڕوانە : ول دیوارنت، قصة الحضارة، الجزء الثالث من المجلد الثالث، مطبعة لجنة التألیف والترجمة و النشر، القاهرة، ١٩٦٤، ص ٣٧١؛ أحمد الشلبي، المصدر السابق، ص ٩٦؛ منصور المخلصي، المصدر السابق، ص ٢٧؛ ابكار السقاف، الدین عند الاغریق والرومان والمسیحیین، ناشره العصور الجدیدة، القاهرة، ٢٠٠٠، ص٥٣٩-٥٤٠.

(١١٠) توفیق الطویل، قصة الاضطهاد الدیني في المسیحیة والاسلام، الزهراء للاعلام العربي، القاهرة، ١٩٩١، ص٤٧-٥٧؛ مازن مغایري، موسوعة العقائد والادیان، دار الرضوان، حلب، ٢٠٠٤، ص ٧٠؛ "موسوعة الادیان في العالم. المسیحیة"، دار كریبس انترناشیونال، ٢٠٠٠، ص ٢٦-٣٢.

ئەمەش تادەهات هێز و توانای ئەم ئایینەی بۆ دەسەلاتداران روونتر دەکردەوە و ناچاری دەکردن پاشەکشە لە هەڵوێستی توندوتیژی بکەن و هەوڵبدەن ئەم هێزە لە خزمەت بەرژەوەندییەکانیان بەکاربێنن، بۆ پاراستنی یەکپارچەیی ئیمپراتۆریا و رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشە دەرەکی و ناوخۆییەکان، تایبەت دوای دەرکەوتنی ململانێ لە پێناو کوورسی دەسەلاتدا، جگە لەوەی ئیمپراتۆریای رۆمانی کە خۆی بە دەوڵەتێکی جیهانی دەزانی پێویستی بە ئایینێکی گشتگیری وەك ئەم ئایینە بوو[١١١]، بۆیە سەرەتای سەدەی چوار بۆ یەکەمجار لە ساڵی (٣١٣ ز) دا ئیمپراتۆر (کوستەنتین - 337 – 306) (Constantine ز) بە پێی فەرمانی (مەرسوم) میلان، دانی بەم ئایینەدا نا وەك سەرجەم ئایینەکانی تری ئیمپراتۆریای ئەژمارکرد و دواتریش لە سەردەمی ئیمپراتۆر (تیۆدۆسیۆس- 395 – 378) (Theodosiusز) بووە ئایینی فەرمی ئیمپراتۆریای رۆمانی[١١٢].

تەوەرەی دووەم: جیابوونەوەی کڵێسای کاتۆلیکی لە کڵێسای ئەرتۆدۆکسی

دوای ئەوەی ئایینی مەسیحی بە رۆژهەلات و رۆژئاوای ئیمپراتۆریای رۆمانیدا بلاوبووەوە و ناوێتەی کەلتوور و رۆشنبیری جیاجیابوو، هەر زوو لە هەر یەك لەم ناوچانەدا تایبەتمەندی و خەسڵەتی تایبەتی وەرگرت و کێشە فیکری و تیۆلۆجییەکان، بەتایبەتی دەربارەی سروشتی کەسایەتی مەسیح دەرکەوتن و هەر لە سەرەتای سەدەی چوارەوە درزی جیابوونەوەی خستە نێو ئەم ئایینەوە، تایبەت دوای قووڵبوونەوەی ململانێی نێوان شارە گەورەکانی وەك ئەسکەندەرییە و رۆما و کۆستانتینۆپل و ئەنتاکیا، بۆ سەرکردایەتیکردنی جیهانی مەسیحی[١١٣].

---

(١١١) بڕوانە: ج. م. هسي، العالم البيزنطي، ترجمة وتقديم وتعليق رأفت عبدالحميد، عين للدراسات والبحوث الانسانية، ١٩٩٧، ص٢٢-٢٣؛ ج.ج. كولتون، عالم العصور الوسطى في النظم والحضارة، ترجمة د.جوزيف نسيم يوسف، دار المعارف، القاهرة، ١٩٦١، ص ٧-٨.

(112) C. Warren Hollister, Medieval Europe. A Short History, 2nd Edition, INC, New York, London and Sydney, 1968, P. 7; Hugh Trevor – Roper, The Rise of Christian Europe, Thomas and Hudson, London, 1965, P. 36.

(113) Geoffery Barraclough, The Medieval Papacy, T and H., London, 1968, PP. 13-15; A. J. Arberry, Religion in the Middle East, Vol. 1, Cambridge University Press, 1976, P.240.

سەرەتای ئەم جیابوونەوەیە لەڕووی فیکرییەوە هەر لە کۆنگرەی ئەفسوسی یەکەمی ساڵی (٤٣١ز)ەوە بەڕوونی دەرکەوت[١١٤] و لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکاندا نەشونمای دەکرد، تا ساڵی (١٠٥٤ ز) بەیەکجاری هەردوو کڵێسای کۆستانتینۆپلی ڕۆژهەڵاتی (ئەرتۆدۆکس) و کڵێسا[١١٥]ی ڕۆمای ڕۆژئاوایی کاتۆلیکی لە یەکدی جیابوونەوە[١١٦]. وشەی کاتۆلیك لە وشەی (Katholikos)ی گریکییەوە وەرگیراوە کە مانای جیهانی، یان گشتی (Universal) دەبەخشێت، بەو مەبەستەی کە ئایینزایەکی گشتی و جیهانییە[١١٧]، هەروەها لاتینی ڕۆژئاوایی زۆر جار بۆ بەکاردێت بەو پێیەی کە سنووری بڵاوبوونەوەی لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای خاوەن ڕۆشنبیری لاتینیدا بووە، تایبەت لە ئیتالیا و ئیسپانیا و بەلجیکا و فەرەنسا و پورتوگاڵ[١١٨]، هەندێ جاریش بە کڵێسای پترۆسی دەناسرێت لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەم کڵێسایە لە لایەن (سانت. پترۆس)ی نێردراوەوە دامەزراوە بە پێی ئەو دەقەی کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە مەسیح پێی دەڵێت: "هەروەها بە تۆ دەڵێم پترۆس کڵێسای من لەسەر ئەو تاشە بەردە دامەزرێنە کە دەرگای دۆزەخ نایگاتێ و کلیلەکانی دونیای ئاسمانت دەدەمێ ..."[١١٩].

---

(١١٤) مازن مغايري، المصدر السابق ، ص ٧٤؛ جان كميي، المصدر السابق ، ص ١٢٦.

(١١٥) كڵێسا (Church) ئەم وشەیە لە وشەی (Ekklesia) ی گریکییەوە هاتووە و هەر لەم وشەیەوە وشەی (Eccleiastical)وەرگیراوە کە بە مانای کۆبوونەوە دێت و سەرەتا بۆ هەموو جۆرە کۆبوونەوەیەك بە کاردەهات، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات بووە مانای کڵێسا. بڕوانە:
Robert Banks and R. Paul Stevens, The Complete Book of Everyday Christianity, IVP, U.S.A, 1997, P. 112.

(١١٦) هوستن سميث ، المصدر السابق، ص ٤٣٨؛ سعد رستم، الفرق والمذاهب المسيحية منذ ظهور الاسلام حتى اليوم. دراسة تاريخية دينية سياسية اجتماعية، الاوائل للنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠٠٤، ص٤٤؛ سليمان مظهر، قصة الديانات، الطبعة الثانية، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢، ص ٤٣٣؛ T.F. Tout, Op.Cit., P. 167.

(117)Wikipedia, The Free Encyclopedia (Catholicism).
www.Wikipdia.org/wiki/Catholicism.

(١١٨) أحمد شلبي، المصدر السابق، ص ٢٣٨.

(١١٩) متي : ١٦، ١٧، ١٨.

کڵێسای کاتۆلیکی هەڵگری باوەڕی دوو سروشتە سەبارەت بە کەسایەتی مەسیح کە دەڵێت مەسیح ئەقنومێکی خواییە، بەڵام دوو گیانی هەیە، یەکێکیان خواوەندی و ئەوی تریش مرۆیی کە لە کۆنگرەی خەلقەدۆنیایساڵی (٤٥١ ز ) ئەمەی بە فەرمی ڕاگەیاند[١٢٠]. لەم کڵێسایەدا سیستەمێکی هەرەمی لە بەڕێوەبردندا پەیڕەو دەکرا کە پاپا لە لوتکەی ئەم هەرەمەدا بوو و بالاترین دەسەڵات بوو، وشەی (Pope) کە بە مەبەستی باوکی ڕۆحی بەکاردەهات لەسەدەی شەشەوە بووە نازناوی ئیپسکۆپسی ڕۆما و دواتریش سەدەی یازدە پاپا (گریگۆری حەوتەم - Gregory 7) (1073 – 1085ز) ڕایگەیاند کە پێویستە ئەم نازناوە تایبەت بێت بە ئیپسکۆپسی کڵێسای ڕۆما[١٢١]. پاپا لە لایەن ئەنجوومەنی کاردینالەکانەوە هەڵدەبژێردرا، ئەم کاردینالانە یاریدەدەری پاپا بوون لە کاروباری بەڕێوەبردندا[١٢٢]. دوای ئەمان سەرۆکی ئیپسکۆپس (Archbishop) دەهات کە سەرۆکی کڵێسای هەرێمێك (Province) بوو و چەند کڵێسایەکی لەبەردەستدا بوو، ئینجا ئیپسکۆپس (Bishop)[١٢٣] و دوای ئەمانیش قەشەکان (Prista) دەهاتن[١٢٤]، ئەمانە کاروباری بەڕێوەبردنیان لە ئەستۆگرتبوو، بۆیە بە فەرمانبەری دونیایی (Secular Clergy) دەناسران، ئەو ڕاهیب و موریدانەش کە لە دێرەکاندا دەژیان و بە ئەرکە ئایینییەکان هەڵدەستان بە فەرمانبەری ڕۆحی ( Regular Clergy) دەناسران[١٢٥].

---

(١٢٠) وفاء فرحات، المصدر السابق، ص ١٧٥؛ شاهر ذيب ابو شريخ، "موسوعة الاديان والمعتقدات"، دار الصفاء للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤، ص ٧١.

(121) Smith and Others, Op. Cit., P. 141.

(122) Schevill, Op. Cit., P. 17.

(١٢٣) ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا لە وشەی (Episkopos) ی گریکییەوە هاتووە، کە مانای چاودێر دەبەخشێت و لە لاتینیشدا بووە بە (Episcopus) و دواتریش لە زمانی ئینگلیزیدا بووە بە (Bishop) و لە زمانی عەرەبیشدا (اسقف) بەکاردێت، بەڵام ئێمە لاتینییەکەمان بەکارهێناوە (ئیپسکۆپس) بڕوانە: "بحث الجنس البشري عن الله"، نيويورك، ١٩٩٠، ص ٢٦٩.

(124) Schevill, Op. Cit., P. 17.

(125) Carlton Hayes and Charles Woolsey Cole, History of Europe Since 1500, 3rd Edition, The Macmillan and Company, New York, 1958, P. 26.

## تەوەرەی سێیەم: دەسەڵات و نفوزی کڵێسای کاتۆلیکی

هاوکات لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی باوەڕدارانی ئایینی مەسیحی و ئاڵۆزبوونی سرووتە (طقوس) ئایینییەکان، کلێسا و پیاوانی ئایینی لە کۆمەڵی مەسیحیدا پتر بەچاوی رێز و پیرۆزییەوە تەماشادەکران[١٢٦]، بۆیە هەر زوو داوای فەرمانبەرداری لە تاکە مەسیحییەکان دەکەن ئەمەش بە روونی لەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە سەرەتای سەدەی دووی زایینیی ئیپسکۆپسی کلێسای ئەنتاکیا بۆ مەسیحییەکانی شاری سمیرنا (Smyrna)ی ناردووە و تێیدا دەڵێت: "پێویستە هەموو مەسیحییەك فەرمانبەردای پێشەنگ و رابەرە رۆحییەکان بن، چۆن فەرمانبەردارییەتی نێردراوەکان دەکەن ..."[١٢٧]، بەلاّم لە سێ سەدەی یەکەمی زایینیدا ئەم هەنگاوانە زۆر سست و لەسەرەخۆ بوون تا سەردەمی کوستەنتین و دوای فەرمانی میلان کە کلێسا چەندین ئیمتیازاتی ئابووری و کۆمەلاّیەتیی وەرگرت[١٢٨] و بە فەرمی تێکهەڵکێشەییەك لە نێوان دەسەلاّتی ئیمپراتۆر و کلێسادا دروست بوو و ئیمپراتۆر وەك سەرۆکی بالاّی کلێسا و نوێنەری مەسیح لەسەر زەوی ناسرا[١٢٩]، بەمەش وەرچەرخانێکی گەورە بەسەر پێگە و هێزی ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسیی کلێسادا هات.

کلێسای رۆما بەو پێیەی کە لە لایەن (سانت. پترۆس)ەوە دامەزراوە و ئیپسکۆپسەکانی شوێنگرەوەی ئەون و نوێنەری مەسیحن لەسەر زەوی، هەر زوو بووە خاوەن پێگەیەکی رۆحی کاریگەر لە کۆمەڵگای رۆژئاوادا، ئیمپراتۆرەکان هەوڵیاندا وەك پشتگیرییەکی رۆحی بۆ پاراستنی یەکپارچەیی ئیمپراتۆریای رۆمانی پشتی پێببەستن، بۆیە زۆربەی ئیمپراتۆرەکانی دوای کوستەنتین هەوڵی سەرکەوتنی ئەم کلێسایەیـــــان دەدا.

---

(١٢٦) بڕوانە: فيسليان شالي، موجز تأريخ الاديان، ترجمة حافظ الجمالي، دار طلاس للدراسات والترجمة والنشر، دمشق، ١٩٩١، ص ٢٥٧.

(١٢٧) أحمد شلبي، المصدر السابق، ص ٢٠٢.

(١٢٨) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: منصور المخلصي، المصدر السابق، ص ٥٦؛ محمود سعيد عمران، معالم تاريخ اوربا في العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٢، ص ٥٩؛ Pat Southern , The Roman Empire from Severus to Constantine, London and New York, 2001, P. 281; "Catholic Encyclopedia",Constantine the Great.www.newadevent.org/cathen/04295c.

(129 ) C. Warren Hollister, Op. Cit., P. 8.

بۆ ئەوەی سەرکردایەتی سەرجەم کڵێساکانی رۆژئاوا بەدەستبهێنێت(١٣٠)، ئەمە جگە لەوەی رووداوە مێژووییەکان وردە وردە دەکەوتنە خزمەت پرۆسەی بەهێزبوونی پێگە و دەسەڵاتی ئەم کڵێسایە لە ئەورووپادا.

هێرشی هۆزە جەرمانییەکان و رووخانی ئیمپراتۆریای رۆمانی ساڵی (٤٧٦ز) گۆرزێکی گەورەبوو بەر ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بەشی رۆژئاوایی کەوت و بە تەواوی بناغەی ژیانی ئابووری تێکشکاند و زەمینەی دەرکەوتنی ئابووری سروشتی و کشتوکاڵی و باڵادەستبوونی سیستەمی دەرەبەگایەتیی خۆشکرد و بووە مایەی لەبەریەکهەڵوەشانەوەی ژیانی فیکری و پەرتەوازەییەکی کۆمەڵایەتی گەورەی لێکەوتەوە، بەمەش ئەو دۆخە کەوتەوە کە پێویستی بە بیروڕایەکی لە چەشنی ئایینی مەسیحی بێت بۆ رێکخستن و ئاراستەکردنی ژیانی کۆمەڵگا(١٣١)، ئەمە جگە لەوەی لە ئارادا نەبوونی دەسەڵاتێکی دونیایی بەهێز هێندەی تر کڵێسای لە بەڕێوەبردن و لە ئەستۆگرتنی کاروباری دادوەری و ئیداری و کۆمەڵایەتی دەستوالاکرد، بەجۆرێك کە کڵێسا و پیاوانی ئایینی لە سەدەی چوار و پێنجدا کۆمەڵێك کرداریان ئەنجامدەدا کە بەهیچ شێوەیەك پەیوەندییان بە ئایینەوە نەبوو(١٣٢).

بەمجۆرە کڵێسای رۆما رۆژ لە دوای رۆژ لە ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەورووپادا کاریگەرتر دەبوو، ئەمەش بەسەر دەسەڵاتە سیاسییەکەیدا کاردانەوەی دەبوو، بۆیە هەر زوو پاپاکان کەوتنە هەڵپەی ملکەچکردنی دەسەڵاتی دونیایی ولەم پێناوەشدا بەدرێژایی سەدە نێوەنجییەکان لەململانێدا بوون لەگەڵ دەسـ ـ ـ ـەڵاتدارە دونیاییەکاندا(١٣٣)

---

(130) Geoffrey Barraclough, Op. Cit., P. 22.

(١٣١) بڕوانە: جهينة سلطان العيسى وآخرون، موجز تاريخ الفكر الاجتماعي، سلسلة علم الاجتماع، الكتاب الثاني، الاهالي للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠٠١، ص ٨٢ – ٩٠؛ هـ . أ. فشر، تاريخ العصور الوسطى، ص١١١ – ١١٢ لە ئینگلیزییەکەیدا، H. A. L. Fisher, Op. Cit., P. 174 – 175.

(١٣٣) بڕوانە: السير جون أ. هامرتن، تاريخ العالم، ترجمة وزارة التربية والتعليم في مصر، المجلد الرابع، مكتبة النهضة المصرية، د. ت.، ص ٣٥١ – ٣٥٢.

(١٣٣) ئەم هەڵوێستەی پاپاکان هەر زوو سەریهەڵدا و بە روونی لەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە پاپا (گلاسیۆسی یەکەم) (٤٩٢-٤٩٦ز) بۆ ئیمپراتۆر (ئەنستاسیۆسی (Anastasius - ناردووە و تێیدا هاتووە: "جەلالەتی ئیمپراتۆر، دوو دەسەڵاتی سەرەکی هەن کە بەشێوەیەکی فەرمی فەرمانڕەوایەتی جیهان دەکەن، ئەوانیش دەسەڵاتی پیاوە ئایینییەکان و دەسەڵاتی پاشاکانن، بەڵام دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی مەزنترە بەو پێیەی لایەنە پیرۆزەکان راڤەدەکات، ئەوەش بزانە کە تۆ هەرچەندە بەسەر رەگەزی مرۆڤدا دەسەڵاتت هەبێ،

و کۆتایی سەدەی یازدەش پاپا (گریگۆری حەوتەم) سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر ئیمپراتۆر (هێنری چوارەم)دا (١٠٥٦ – ١١٠٦ز) بەدەستهێنا و دواتریش لە سەردەمی پاپا (ئینوسنتی سێیەم)دا (١١٩٨ – ١٢١٦ز) دەسەلاتی پاپایی گەیشتە لوتکەی بەهێزی[١٣٤].

کەواتە بە تێپەڕبوونی کات کلێسای کاتۆلیکی بووە توخمێکی کاریگەری پێکهاتەی کۆمەلآیەتی و فیکری و سیاسیی کۆمەلگای دەرەبەگایەتی سەدەنێوەنجییەکان لە ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەورووپا، دوای ئەوەی لەڕێی بەخشی و سەدەقە و لێبوردن لە دانی تەواوی باجە دونیاییەکان بوو بە خاوەن گەورەترین سەروەت و سامان و سێ یەکی باشترین زەوی و زاری ئەورووپای کەوتە دەست، لەوساوە بۆ خۆی بووە گەورەترین دەرەبەگ[١٣٥] و پارێزەری ئەو بارودۆخە و لەم پێناوەشدا بووە پێکهێنەری بنەمای فیکری سیستەمی دەرەبەگایەتی و بەجۆرێك پرەنسیپەکانی دادەتاشی، کە بتوانێت خزمەت بە ڕەوشی باو بکات[١٣٦] بە جەختکردنەوە لەسەر ژیانی دونیای ئاسمان بەو پێیەی کە سەرجەم هەژاری و ئازارەکانی سەرزەوی کاتین و لەو دونیادا قەرەبوو دەبنەوە و بەجۆرە دەبێتە هاندەری جووتیاران بۆ خزمەتکردنی گەورەکانیان بە پێی دەقی وتەی (سانت. پۆل) کە دەڵێت: "... بە کۆیلەکان ڕابگەیەنە گوێڕایەڵی گەورەکانیان بن و ڕازییان بکەن، سەرپێچییان نەکەن..."[١٣٧] هەروەها هەوڵی ملکەچکردنی کۆمەڵ بۆ دەسەلآت و ڕەوشی باو بەو بیانووەی گوایە دەستکرد و ئیرادەی

---

دەبێ سەری ڕێز بۆ پیاوانی ئاینی دانوێنی و لە دەستی ئەوانەوە چاوەڕێی ڕزگاری بیت، ... بۆیە پێویستە دان بە ملکەچیدا بنێیت بۆیان نەك خۆت بە گەورەتر بزانیت ..." بڕوانە:
"Medival Source book: Gelasius I, On Spiritual and Temporal Power, 494".
www.fordham.edu/halsall/source/gelasius1.html.

(١٣٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : F. Tout, Op. Cit., P. 313 – 335 .

(١٣٥) بڕوانە: "بحث الجنس البشري عن الله"، ص ٣٠٧؛ Herbert Heaton, Economic History of Europe , Harper and Brothers, New York, 1948, P. 83; Arthur P. Watts, A History of Western Civilization. From the Reformation to the Present, Vol. 2, Prentichall, INC, 1940, P. 12.

(١٣٦) ابراهيم كبة، دراسات في التأريخ الاقتصادي والفكر الاقتصادي، الجزء الاول، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٧٣، ص ٤٤٢؛ جهينة سلطان العيسى وآخرون، المصدر السابق، ص ٨٩ – ٩٠ .

(١٣٧) رسالة القديس بولس الرسول الى تيطس (١، ٢)، "الكتاب المقدس"، جمعية الكتاب المقدس في لبنان، ١٩٩٦، ص ٣٣٣.

خوایه[١٣٨] و داماڵینی مرۆڤ له ئیراده و وابەستەکردنی به کڵێسا و دەسەڵاتی پاپاوه بەو پێیەی که ئەمان تاکه ڕێگای پەیوەندی نێوان مرۆڤ و یەزدانن و کلیلی نهێنییەکان له دەستی ئەواندایه و داهێنانی چەند پەیڕەوێکی ناڕوون و غەیبی، بەتایبەتی (حەوت نهێنییەکان – Sacraments)[١٣٩] که له سەدەی دوازدەوه به تەواوی بەرجەستە بوون و بریتین له:

١- ڕاگیرکردن – تەعمید –Baptism : واته خاوێنکردنەوەی ئەو منداڵەی لەدایکدەبوو له گوناهی یەکەم، له ڕێی شۆرین و لەئاوهەڵێنانی به دەستی قەشه.
٢- چەسپاندن – Confirmation : چەسپاندنی منداڵ لەسەر مەسیحییەت بەیەکجاری له ساڵی حەوتەمی تەمەنیدا، به سڕینەوەی به ڕۆنی پیرۆز له لایەن قەشەوه.
٣- قوربانی پیرۆز (شامی خوایی – العشاء الرباني) Transubstatiation : ڕێوڕەسمی خواردنی ئەو نان و مەیەی که دەبێت به گۆشت و خوێنی مەسیح.
٤- تۆبەکردن – Penance: واته داوای لێبوردن و تۆبەکردن له گوناهکاری و دانپێدانانیان لەبەردەم قەشه.
٥- سڕینەوەی پیرۆز – Exteremination : واته چەورکردنی لاشەی نەخۆش به ڕۆنی پیرۆز به نیازی چاکبوونەوه یان ئومێدپێدان.
٦- نهێنی قەشه – Holy Order : ڕێوڕەسمی پیرۆزبایی کردن لەو کەسانەی که پۆستی ئایینی و قەشەگەری له نوێ بەدەستدێنن له لایەن پیاوه ئایینییه گەورەکانەوه.
٧- نهێنی هاوسەرگیری – Matrimony: مارەبڕی پیرۆز و هەمیشەیی نێوان ژن و مێرد.

ئەمه سەرەڕای ئەوەی که به پاوانکردنی پرۆسەی خوێندن و زمانی لاتینی، پیاوانی ئایینی بۆ خۆیان بوونه توێژی خوێندەوار و ڕۆشنبیری سەدە نێوەنجییەکان و هەر خۆیان بوونه خوێنەر و

---

(١٣٨) محمد طه بدوي، اصول علوم السياسة. علم اصول السياسة-دراسة منهجية، الطبعة الثانية، المكتب المصري الحديث للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٥، ص ٢١٩. ئەم هەڵوێستەی ئایینی مەسیحی هەر له سەردەمی (سانت. پۆڵ)ەوه به ئاشکرا دەرکەوت و دواتریش کڵێسای کاتۆلیکی هەڵوێستی خۆی پێ پشت ئەستوور کرد، تایبەت لەو نامەیەدا که بۆ ڕۆمای ناردووه دەڵێت: "پێویسته هەموو مرۆڤێك ملکەچی خاوەن دەسەڵاتەکان بێت و هەموو دەسەڵاتێك لای خواوەیه و ئەو دایناوه، ئەوەی دژایەتی بکات دژایەتی خوای کرد ..." رسالة قديس بولس الرسول الى روما (١٣)، "الكتاب المقدس"، ص ٣٤٥.

(139) Schevill, Op. Cit., P. 16.

راڤەکەری کتێبی پیرۆز بەجۆرێك کە لەسەدەی سێزدەوە خوێندنەوەی کتێب و دەقە پیرۆزەکان بێ ئاگاداری و مۆڵەتی کڵـێسا و پیاوەکانی قەدەغەکرابوو[١٤٠].

کڵـێسای کاتۆلیکی دوای ئەوەی بوو بە دەزگایەکی گەورە و خاوەن هێز و سوپای خۆی و کارەکانی لە ڕێی تۆڕێکی فراوانی کارگێڕییەوە بەڕێوەدەچوو، ئیدی تادەهات پێداویستییە دارایيەکانی پتر دەبوون، هەمانکات لەگەڵ گەشەسەندنی ژیانی ئابووری و دەرکەوتنی دراو و فراوانبوونی خۆشگوزەرانی پاپا و پیاوانی ئایینی پتر دەکەوتنە هەڵپەی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و لەم پێناوەشدا ڕۆژ بە ڕۆژ شێوازی نوێتریان دادەهێنا، بۆیە لە پاڵ ئەو باجانەدا کە پێشتر کڵـێسا وەریدەگرتن وەك باجی (دەیەك) کە لە ڕێی ئەم باجەوە کڵـێسا ساڵانە دەیەکی داهاتی لە دانیشتوانی جیهانی کاتۆلیکی وەردەگرت[١٤١] و باجی سانت پترۆس ( Peter's Pente) ئەو ساڵانەیەی کە دەبوو هەموو خێزانێك ساڵانە بیداتە کڵـێسا، چەندین شێواز و ڕێگایان داهێنا بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان وەك باجی (ئەناتس – Annates)، کە بریتیبوو لە وەرگرتنی داهاتی ساڵی یەکەمی ئەو کەسانەی لە نوێ پۆستی ئایینییان وەردەگرت[١٤٢]، هەروەها دەوڵەمەند و خاوەن موڵکەکانیان ناچاردەکرد، کە دوای مردنیان بە پێی وەسیەتنامەیەك بەشێکی سەروەت و سامانەکەیان بە کڵـێسا ببەخشن و لە ساڵی (١١٧٠ز) بەدواوە بە پێی بڕیاری پاپا (ئەلکساندەری سێیەم) دەبوو ئەم وەسیەتنامەیە لە لایەن قەشەیەکەوە بنووسرێت، هەر کەسێکیش سەرپێچیی بکردایە بۆی نەبوو لەو شوێنەدا بنێژرێت کە تایبەت بوو بە پیاوچاکان[١٤٣]، ئەمە وێڕای بڵاوتربوونی بەردەوامی دیاردەی مامەڵەکردن بە پۆست و پلە ئایینییەکانەوە، بۆ نموونە پاپا (ئەلکساندەری شەشەم) (١٤٩٢ – ١٥١٣ز) ئەم پۆستانەی وەك کاڵا دەخستە بازاڕەوە[١٤٤].

پسولەی لێبوردن (Indulgence) یەکێکی تر بوو لە شێوازە سەیرەکانی کڵـێسا بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان، سەرەتای ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەنگی

---

(١٤٠) فيلسيان شالي، موجز تاريخ الاديان، ص ٢٥٩.

(١٤١) باجی دەیەك (Tithes) مافی کۆکردنەوەی ئەم باجە لە سەدەی نۆوە و لە سەردەمی (چارلسی گەورە)وە درا بە کڵێسا. بڕوانە : Mott and Dee, Op. Cit., P. 51.

(142) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 11.

(١٤٣) ول ديوارنت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد الرابع، ص ٦٩.

(١٤٤) بۆ زانیاری پتر بڕوانە : "The Cambridge Modern History" , Vol. 1, PP. 231 - 235 .

خاچپەرستان، ئەوە بوو هەر لە ساڵی (١٠٩٥ز)ەوە پاپا (ئەربانی دووەم) بڕیاریدا هەرکەسێك بەشداری ئەو جەنگە بکات خوا لە تەواوی گوناهەکانی خۆشدەبێت[١٤٥]، بەڵام هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی دراو و گەشەسەندنی ژیانی ئابووری ئەم پرۆسەیە گەشەیدەکرد[١٤٦] و بە تێپەڕبوونی کات بوو بە یەکێك لە بنەماکانی باوەڕ[١٤٧]، هەر یەك لە پاپا و پیاوە ئایینییەکان لیستی تایبەت بە گوناهەکان و نرخی لێبوردنەکانیان پێبوو[١٤٨].

ئەم شێوازە بە تێپەڕبوونی کات فرەچەشن و سەیرتر دەبوو، بۆ نموونە پاپا (بۆنیفاسیوسی هەشتەم) (١٢٩٦ – ١٣٠٣ز) دوای ئەوەی ساڵی (١٣٠٠ز) رایگەیاند هەرکەسێك سەردانی کڵـێسای رۆما بکات خوا لە گوناهەکانی خۆشدەبێت و خەڵکێکی ئێجگار زۆر بەدەست و دیارییەوە روویانکردە رۆما، دواتریش پسولەی لێبوردنی لە بری ئەم سەردانە بۆ ئەو کەسانە دانا کە توانای سەردانیان نەبوو بەهەر هۆیەکەوە بووبێت[١٤٩]، جگە لەوەی لە کۆتایی سەدەی چواردە بەدواوە دەتوانرا لە رێی ئەم پسولانەوە لێبوردن بۆ مردووەکانیش بەدەستبهێنرێت[١٥٠]. بەمجۆرە کلـێسای کاتۆلیکی بوو بە گەورەترین موڵکدار و خاوەن سامان لە رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپادا، تایبەت دوای ئەوەی لە کۆتایی سەدەی یازدەدا بۆ بەرگرتن لەپەرش و بڵاوبوونەوەی سەروەت و سامانی کلێسا بەسەر میراتگرانی پیاوە ئایینییەکاندا پاپا (گریگۆری حەوتەم) بڕیاری رەبەنی، واتە ژن نەهێنان تا مردنی بەسەردا سەپاندن[١٥١].

کۆبوونەوەی ئەو سامانە زۆرە و شێوازی نوێی ژیان رۆژ بە رۆژ پاپا و پیاوانی کلێسای لە ژیانی ئایینی دوور دەخستەوە و بەرەو ژیانی دونیایی و رابواردنی ژیانی دەبردن، بەجۆرێك لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا چەند پاپایەکی دونیایی ئەوتۆ دەرکەوتن کە بە بەدڕەوشتی ناوبانگیان رۆیشتبوو، بۆ نموونە (ئەلکساندەری شەشەم) بە راشکاوی دانی بە منداڵە

---

(١٤٥) ول ديوارنت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد الرابع، ص ١٨.

(146) Richard Hooker, Discovery and Reformation, (Indulgence), 1996. www.wsu.edu/8080/-dee/REFORM.html.

(١٤٧) موسوعة الاديان في العالم. الاصلاح الديني المسيحي"، ص ١٣.

(١٤٨) سليمان مظهر ، المصدر السابق، ص ٤٤٩.

(١٤٩) موسوعة الاديان في العالم. الاصلاح الديني المسيحي" ، ص ١٤.

(150) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 16.

(١٥١) منصور المخلصي، المصدر السابق، ص ١٣٩ – ١٤٠؛ جان كميي، المصدر السابق، ص ١٧٨.

ناشەرعییەکانی خۆیدا نا[١٥٢]، جگە لەوەی کە گەندەڵی و ناپاکی لەبەکارهێنانی پلە و پۆستە ئایینییەکان و سەروەتی کلێسا بەردەوام لە پەرەسەندندا بوو و بۆ مەرامی تایبەتی و دەوڵەمەندکردنی خزم و کەسانیان بەکاردەهێنرا، بۆ نموونە کەسێکی وەك پاپا (سکیستی چوارەم) (١٤٧١–١٤٨١ز) سامانێکی زۆری کلێسای بۆ دەوڵەمەندکردنی برازا و خوشکەزاکانی تەرخانکرد[١٥٣]، هەروەها ئیپسکۆپسەکان بارتەقای پاپاکان ئەم کارەیان ئەنجامدەدا، بۆیە پاپا (ئەلکساندەری سێیەم) دەڵێت: "هەرچەندە خوا ئیپسکۆپسەکانی لە وەجاخ بێبەش کردووە بەڵام شەیتان منداڵی برا و خوشکی پێداون"[١٥٤].

دێرەکان کە سەرەتای سەرهەڵدانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی زایینی و بە دوورکەوتنەوە لە ژیانی دونیایی و خۆتەرخانکردن بۆ خواپەرستی دەستیپێکرد[١٥٥]، جارێکی تر لە سەدەی یازدەدا بە مەبەستی ڕێگرتن لە گەندەڵی و بێباوەڕی سەریانهەڵدایەوە، بەڵام هێندەی نەبرد ئەم دێرانە بوونە بەشێکی دانەبڕاو لە کلێسای کاتۆلیکی و بە تێپەڕبوونی کات بوونە گەورەترین خاوەن زەوی و سامان و چەندین دەزگای پیشەگەری، پەیتاپەیتا لە بنەماکانیان دوورکەوتنەوە و بوون بە ناوەندی رابواردنی دونیایی و بەدڕەوشتی[١٥٦]، بۆیە پاپا (ئینوسنتی سێیەم) (١١٩٨ – ١٢١٦ز) زۆر بە راشکاوی دەڵێت: "دێری ئەگاسا ناوچەکەی گەندەڵ کردووە" و هەروەها ئیپسکۆپسکی شاری روانساڵی (١٢٤٩ز) لە راپۆرتێکدا باسی بەدڕەوشتی یەکێك لە دێری ژنەکان دەکات[١٥٧].

بەمجۆرە کلێسای کاتۆلیکی لە دواداویی سەدە نێوەنجییەکاندا بە سەرجەم ئۆرگانەکانییەوە بوو بە دەزگایەکی دونیایی گەورە و تادەهات سیما و خەسڵەتە ئایینییەکانی لەدەستدەدا و کاریگەرییە رۆحییەکەی بەرەو کاڵبوونەوە دەچوو.

---

(١٥٢) بحث الجنس البشري عن الله"، ص ٣٠٨ ؛ "The Cambridge Modern History", Vol. 1, PP.233 – 235

(١٥٣) بڕوانە: Ernst Breisach, Op. Cit., P. 122-123 :.

(١٥٤) ول ديوارنت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من الجلد الرابع، ص ٥٤.

(١٥٥) منصور المخلصي، المصدر السابق، ص ٦٧؛ جان كميي، المصدر السابق، ص ١٠٨ – ١٠٩.

(١٥٦) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من الجلد الرابع، ص١٠٨؛ احمد شلبي، المصدر السابق، ص٢٤٨–٢٤٩ ؛ سعيد عبدالفتاح عاشور، أوروبا العصور الوسطى...، الجزء الثاني، ص٢٥١–٢٥٢.

(١٥٧) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: عبدالقادر احمد اليوسف، المصدر السابق، ص ٢٤٨ – ٢٤٩.

## باسی چوارەم:

### هەوڵ و تەقەللا ریفۆرمخوازییەکان بەر لە سەدەی شازدە

سەرجەم ئەو فراوانبوونەی بەسەر پێگەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی کلێسادا هات و تەواوی ئەو هەولآنەی کلێسا و پیاوەکانی بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان، هەروەها گۆڕانی کلێسا لە دەزگایەکی ئایینییەوە بۆ دەزگایەکی دونیایی گەورە و بوونی بە بەرگریکەری سیستەمی دەرەبەگایەتی، بەدوورکەوتنەوە و لادان لە بنەما و پرەنسیپەکانی سەرەتای ئایینی مەسیحی بەدیدەهاتن و فەراهەم دەبوون، بۆیە هەر زوو زۆرێك لەم کردەوانەی کلێسا وەك رەگەزی گەندەڵی دەرکەوتن و بوونە جێی رەخنە و توانجی بەپەرۆشانی فیکر و ئایین[158] و هەر لە سەرەتای سەدەی یازدەوە هەوڵە سەرەتاییەکانی بەرەنگاربوونەوەی کلێسای کاتۆلیکی دەرکەوتن و شانبەشانی ئەو گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییانە لە هەنگاودا بوون کە سەرتاپای کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیی بەرەو هەڵدێری نەمان دەبرد.

گەشەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ناوچانەی گرتەوە کە پێشتر باسکران[159]، تادەهات بزووتنەوە جووتیارییەکانی دژی دەرەبەگەکان بەگوڕتر دەکرد، کلێسا و پیاوەکانیشی کە توخمی سەرەکی چینی دەرەبەگیان پێکدەهێنا لەم بەرەنگاربوونەوەیەدا بێبەش نەبوون، بۆیە بەشی زۆری رووبەڕووبوونەوە ئایینییەکان هەوڵی زەقکردنەوەی لایەنە کۆمەڵایەتییەکانیان دەدا

---

(١٥٨) دیارە دانوستاندن و بەدواداچوون لەمەڕ گەندەڵی کلێسای کاتۆلیکی دەمێك بوو سەرەتای گرتبوو، بۆ نموونە لەسەردەمی پاپا (گریگۆری دووەم)دا (٦٦٩ – ٧٣١ ز) بە ئاشکرا کڕین و فرۆشتنی پۆستە ئایینییەکان بووە جێی مشتومڕ. بڕوانە: رمسیس عوض، الهرطقة في الغرب، سيناء للنشر، القاهرة، مؤسسة الانتشار العربي، بيروت، ١٩٩٧، ص ١١٩.

(١٥٩) بۆ زانیاری پتر لە بارەی ئەو گەشەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکرییانە بڕوانە باسی دووەم لە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا.

و سەروەت و سامانی کڵێسا گرێژنەی سەرەکی باسەکانیان دەبوو[١٦٠]. هاوکات لەگەڵ ئەم گەشەسەندنانەدا و ئەو رابوونە فیکرییەی کە لە سەدەی یازدە بەدواوە ئەورووپای گرتەوە و پەیتاپەیتا بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا کاردانەوەی دەبوو، رۆژ بە رۆژ خەڵکە ساکارەکەی لە رەخنەگرتن و دەرککردن بە گەندەڵییەکان هەستیار دەکرد، بەمەش هێدی هێدی کڵێسای کاتۆلیکی خۆی لەبەردەم ململانێ لەگەڵ هەست و ویستی کۆمەڵدا بینییەوە کە گوزارشتی لەو وەرچەرخانە دەکرد کە خودی ژیانی مرۆڤی گرتبووەوە و بە شێنەیی بەرەو پێش لە هەنگاودا بوو، بە جۆرێك کە تادەهات کڵێسا و ئۆرگانەکانی توانای بەردەوامییان لەگەڵ ئەم رابوونە گشتگیرەدا لەدەستدەدا.

ئەمانە هەمووی لەو رۆژگارەدا بوون کە ئایین رەنگرێژکەری تەواوی کایەکانی ژیان بوو، بۆ خۆی تاکە راڤەکەر و ئاراستەکەر بوو لە کۆمەڵگادا، ورد و درشتی کار و فرمانەکانی تاك و کۆمەڵ بە سروودە ئایینییەکانەوە گرێدرابوون، بۆیە تەواوی رووداوەکان لە دیدگایەکی ئایینییەوە تەماشادەکران، ئەمەش وایکردبوو کە بەشی هەرە زۆری نەهامەتی و نەکاراییەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتی بە ئەنجامی ئەو گەندەڵییانە دەزانران کە بەسەر ژیانی ئایینی و سەروەت و سامانی کڵێسا و پیاوەکانیدا هاتبوون و چارەسەرکردنیشیان ببوو بە فریادڕەسی سەرەکی رەوشەکە و تادەهات کۆمەڵگا بۆی بە پەرۆشتر دەبوو، ئەمەش ئەو خرۆشانە ئایینییەی لێکەوتەوە کە لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا کۆمەڵگای جیهانی کاتۆلیکی گرتەوە کە رواڵەتەکانی هەر لە سەدەی دوازدەوە بەچەند شێوازێك دەرکەوتن، هەندێکیان بە ژیانی سۆفیگەری و خۆتەرخانکردن بۆ خواپەرستی لە دێرە دوورەکاندا دەستیانپێکرد، برێکی تریشیان جاڕی کۆتایهاتنی دونیایان دەدا و داوای گەڕانەوەیان دەکرد بۆ ژیانی ئایینی راستەقینە، کۆمەڵێکیشیان بوون بە دەروێش و گەڕیدەی سەرشەقامی شارەکان و بەدەم زیکر و لەخۆدانەوە دەگەڕان، گرووپێکی تریشیان رێچکەیەکی رادیکالییان گرتەبەر و بە هێرشکردنە سەر پاپا و کڵێسای کاتۆلیکی دەستیانپێکرد و هێدی هێدی لە قاڵبی بێ سەروبەرەیی دەچوونەدەر و دەبوونـــــە مایـــەی تـــرس و هەڕەشە بۆ کڵێسای کاتۆلیکی[١٦١]، بۆیە بە

---

(١٦٠) بروانە: رمسیس عوض، الهرطقة في الغرب، ص ١١٩ – ١٢٠؛ Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 23.

(161) Hugh Trevor – Roper, Op. Cit., PP. 150-155.

هێرتێکی (Heretic) [١٦٢]، واتە هەڵگەڕاوان و لەباوەڕدەرچووان ناوزەدکران و سەرەنجام ئەم ڕەوتە توانی شان بە شانی ڕەوتی گەشەکردن لە ئەورووپا هەنگاوبنێت تا دەرکەوتنی بزووتنەوەی ریفۆرمی گەورە لە سەدەی شازدەدا.

ئەلبیجینسەکان (Albigenses)[١٦٣] و والدینسەکان (Waldenses) دوو نموونەی هەرە دیار و کاریگەری ئەو هەوڵە رادیکالییانەن کە لە کۆتایی سەدەی دوازدەدا بە جۆرێك بوونە مایەی ترس لای کڵێسا کە لە سەرەتای سەدەی سێزدە لە لایەن پاپا (ئینوسنتی سێیەم)وە بانگەشەی لەشکرکێشی خاچی بۆ لەناوبردن و بنەبڕکردنیان کرا[١٦٤].

ئەم ئەلبیجینسانە هەر لە سەدەی یازدەوە لە ناوچەکانی باشووری فەرەنسادا دەرکەوتن، بانگەشەی ژیانی هەژارییان دەکرد و ڕەخنەیان لە زۆرێك لە پەیڕەوەکانی کڵێسای کاتۆلیکی دەگرت، وەك پەرستنی سانتەکان و حەوت نهێنییەکان، پەیڕەوێکی ئایینی تایبەتیان هەبوو[١٦٥]. هەر لە ناوچەکانی باشووری فەرەنساوە والدینسەکان لەسەر دەستی (پیتەر والدۆ - Peter Waldo) ەوە سەریانهەڵدا، (والدۆ) بازرگانێکی شاری لیۆن بوو و ساڵی (١١٧٠ز) چەند زانایەکی بەکرێگرت بۆ وەرگێڕانی ئینجیل بۆ سەر زمانی میللیی باشووری فەرەنسا و گەیشتە ئەو باوەڕەی کە دەبێت تاکی مەسیحی بگەڕێتەوە سەر شێوازی ژیانی سەردەمی

---

(١٦٢) لە وشەی (Heresy) ی گریکییەوە هاتووە و مانای دەرچوو لەو باوەڕە دەگەیەنێت کە لە سەردەمێك و شوێنێکی دیاریکراودا وەك هەڵسوکەوتێکی باوی کۆمەڵی لێبێت لەو کۆمەڵگایەدا. بڕوانە: رمسیس عوض، الهرطقة في الغرب، ص٧، ئەم وشەیە لە لایەن کڵێسای کاتۆلیکییەوە بۆ هەموو ئەو کەسانە بەکاردەهات کە بەهەر شێوەیەك و لە هەر ڕوویەکەوە ببوونایە مایەی هەڕەشە بۆ بەرژەوەندییەکانیان.

(١٦٣) لایەنگرانی بە کاتری (Cathary) ناسرابوون ، ئەم بیروباوەڕە لە ناوچەی ئاسیاوە گواسترایەوە بۆ ئەورووپا لە ڕێی بەڵکانەوە و لایەنگرێکی زۆری لە باکووری ئیتالیا هەبوو. بڕوانە :

George Holmes, The Oxford Illustrated History of Medival Europe, Oxford University Press, 2001, P. 226 .

هەڵگرانی ئەم باوەڕە بە باوەڕی دوالیزمی مانی کاریگەر بوون کە یەکێك بوو لە ئایینەکانی ئێرانی کۆن و لە سەدەی چواردا تێکەڵ بە پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی بوو. بڕوانە:

Hough Trovr – Roper, Op. Cit., P. 155.

(١٦٤) "بحث الجنس البشري عن الله"، ص ٢٨٢.

(165) Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 258; Hugh Trevor – Raper, Op. Cit., P. 155; George Holmes, Op. Cit., P. 330.

نێردراوەکان، بۆیە سەروەت و ساماناکەی بەسەر لایەنگرەکانیدا دابەشکرد[١٦٦]، هەرچەندە سەرەتا ئەم کۆمەڵە لە لایەن پاپاوە مۆڵەتیان پێدرا، بەڵام هێندەی نەبرد لە ژێر کاریگەری ئەلبیجینسەکاندا بوونە کۆمەڵێکی رادیکال و بە توندی هێرشیانکردە سەر کڵێسا و بە ناوچەکانی بیدمۆنت و ئەڵمانیا و بۆهیمیا و هەنگاریا و تەنانەت ئیسپانیاشدا بلاّبوونەوە[١٦٧]

کڵێسای کاتۆلیکی بۆ دامرکاندنەوەی ئەم هەولاّنە و خەفەکردنی تەوژمی هێرشە فیکری و تیۆلۆجییەکان جگە لە لەشکرکێشی چەکدارانە رێگای جۆراوجۆری تریشی گرتەبەر، هەر لە سەرەتای سەدەی سێزدەوە بە پشتیوانی دەسەلاّتی دونیایی (دادگای پشکنین — Inquisition)[١٦٨]ی دامەزراند بۆ راوەدوونانی ئەو کەسانەی گومانی ئەوەیان لێدەکرا کە دژ بە کڵێسا دەوەستن و بە نامرۆڤانەترین شێوە کەوتنە وێزەی ئەو کەسانەی کە تاکە وشەیەکیان دژی کڵێسا بدرکاندایە و دڕندانەترین شێوازی ئەشکەنجەیان دەرهەقیان پیادەدەکرد و قورسترین جۆرەکانی سزایان بەسەردا دەسەپاندن[١٦٩]، لە ماوەی نزیکەی دوو سەدەدا دەیان هەزار کەسیان لە ئاگردا سوتاند و بەزیندانی هەمیشەیی سزایاندان و سزای ماڵییان بەسەر هەزاران کەسدا سەپاند، تەنانەت بەسەر مردووەکانیشدا و منداڵەکانیان لە زۆربەی مافەکانیان بێبەش دەکردن[١٧٠].

ئەمە جگە لەو هەوڵ و تەقەللا زۆرەی کە بۆ نۆژەنکردنەوەی هێزی فیکری و رۆحییان خستیانە گەڕ، بەڵام لە توانای پیاوانی ئایینی کڵێسادا (Secular) نەمابوو، بۆیە هانایان

---

(166) Stephonson , Op. Cit., P. 345; J.C. Roberrtson, Sketches of Church History. From AD 33 to the Reformation, Christian Classics Ethereal Library, New York, 2002, P. 224. www.ocel.org/coel/robertson/history.html.

(167) Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 258; Stephanson, Op. Cit., P. 345.

(١٦٨) ساڵی (١٢٣٣ز) رۆژگاری پاپا (گریگۆری ٩) بڕیاردرا بەسەرجەم کڵێساکاندا بۆ دیاریکردنی پیاوێکی ئایینی تایبەت بە لێکۆڵینەوە لە گومان لێکراوان و لە لایەن تۆرێکی سیخوڕییەوە یارمەتی دەدران، ئەم سیخوڕانە لە هەموو تاوان و گوناهێك دەستوالاّدەکران. سلیمان مظهر، المصدر السابق، ص ٤٣٩.

(١٦٩) بۆ زانیاری پتر لەم رووەوە بڕوانە: توفیق الطویل، قصة الاضطهاد...، ص ٨٢ -٨٣؛ سلیمان مظهر، المصدر السابق ، ص ٤٤٠ — ٤٤٦.

(١٧٠) تەنانەت لە نێوان ساڵانی (١٤٨٣ — ١٤٩٨ز) دا تەنها لە ئیسپانیادا نزیکەی ٢٠٠٠ کەس لە ئاگردا سوتێنران و دەیان هەزار کەس بە زیندانی هەمیشەیی و سزای ماڵی سزادران. بڕوانە :

Schevill, Op. Cit., P. 76.

بردەبەر ئەو بزووتنەوە سۆفیگەرییانەی کە لە سەرەتای سەدەی سێزدەدا لە ئەنجامی گۆڕانکاری ژیانی ئابووری و بۆ بەرگرتن بە تەوژمی ناقایلەکان وەك هەوڵێکی ریفۆرمخوازی لە کڵێسادا هاتنە ئاراوە کە (فرانسیسکان – Franciscans)[171] و (دۆمەنیکان – Domanican)[172] دیارترینیان بوون و بەنێو فێرگە و مەیدانە فیکرییەکاندا تەشەنەیانکرد تا بتوانن بەو زمانە لەگەڵ ئەو رەوتە ناقایلانەدا بدوێن کە تێیدەگەن[173]، بەلاّم بێنەوەی هیچ رێگایەك لەمانە ئامانج بپێکن کە جگە لەوەی نەیاندەتوانی بەر بە رەوتی گەندەڵییەکانی کڵێسا بگرن، بەڵکو بۆخۆیان بوونە توخمێکی سەرەکی ئەو گەندەڵییانە، هەمانکاتیش بوونە مایەی جیابوونەوەی بەرەی دژە کڵێسا و ریفۆرمخوازە رادیکالەکان لە بەرەی بەرگریکەری کڵێسا.

سەرەتای سەدەی چواردە بەدواوە نارەزایی و تانەدان لە گەندەڵییەکانی کڵێسا و ژیانی پیاوانی ئایینی و دێرەکان و فەرامۆشکردنی ئەرکە ئایینییەکان بوونە وێردی سەر زمانی بەشی زۆری کۆمەڵــگا و هەژاری خەڵکیان بە ئاشکرا بۆ زۆربوونی سەروەت و سامانی کڵێسا و باج و سەرانەکانی دەگەڕاندەوە[174]. هاوکات پێشکەوتنی فیکر و فێربوون تادەهات کۆمەڵــی لە

---

(١٧١) ئەم رەوتە سۆفیگەرییە لە لایەن (فرنسیس ئاسیزی) (١١٨١-١٢٢٦ز) یەوە دامەزرا کە کوڕی یەکێك لە بازرگانە دەوڵەمەندەکانی ئیتالیا بوو، سەرەتای ژیانی بە خۆشگوزەرانی و رابواردن بەسەربرد، بەلاّم هێندەی نەبرد لە تەمەنی ٢٠ ساڵییەوە روویکردە ژیانی زوهد و هەژاری و دواتـریش سـەروەت و سـامانەکەی بەسـەر هەژاراندا دابەشکرد و دەستیدایە بزووتنەوەیەکی سۆفیگەرییانە و ساڵی (١٢١٠ز) لە لایـەن پاپـاوە مۆڵـەتی پێدرا و تادەهات مورید و لایەنگرانی زۆرتر دەبوون بە جۆرێك لە ساڵی مردنی (فرانسیس)دا نزیکەی (٥٠٠٠) موریدی هەبوو. بڕوانە: عبدالقادر أحمد الیوسف، المصدر السابق، ص ٢٤٦-٢٤٧؛ T.F. Tout, Op. Cit., PP. 434 - 436

(١٧٢) دامەزرێنەری ئەم کۆمەڵەیە ناوی (دۆمەنیك) (١١٧٠ – ١٢٢١ز) بوو بە رەچەڵەك خەڵکی کاستل بوو، هەوڵەکانی دژ بە تەقەللا دژە کڵێساییەکان دەستپێکرد، تایبەت ئەلبیجینسییەکان و ساڵی (١٢١٦ز) بە دواوە روویکردە ناوچەکانی باشووری فەرەنسا و لە رێی گوتارەکانییەوە شوێنکەوتووانێکی زۆری بە دەوردا کۆبوونەوە و ساڵی (١٢١٦ز) مۆڵەتی کاری لە پاپا وەرگرت، جێی باسە ئەم دۆمەنیکانە یاریدەدەرێکی گەورەی (دادگا پشکنینەکان – محاکم التفتیش) بوون و لە بواری فیکردا رۆڵێکی بەرچاویان گێڕا. بڕوانە:
Smith and Others, Op. Cit., P. 247 – 248.

(173) Hugh Trevor – Roper, Op. Cit., P. 159.

(174) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 23.

یەکدینەگرتنەوەی ئەم شێوازی بەڕێوەچوونەی کڵێسا و پیاوەکانی لەگەڵ سەردەمی نێردراوەکان و سەرەتاکانی ئایینی مەسیحی ورياتر دەکردەوە، بەمەش ڕۆژ بەڕۆژ چارەسەری ئەم ڕەوشە پتر دەبووە پێویستییەکی ڕاستەقینە لە زەین و هۆشی زۆرینەی خەڵکیدا. ئەمانە لە لایەك، لەلایەکی تریشەوە بۆ بەرگرتن بە هەوڵی بەردەوامی سکۆلاستییەکان لەپێناو هاوسەنگکردن لە نێوان ئاین و فیکرە فەلسەفییەکاندا[175] کە هەموو ئەمانە هاوکاتبوون لەگەڵ ئەو پێشکەوتنانەی کە زانکۆکان و دیراسەکردنی تیۆلۆجیا بەخۆیەوە بینیبووی[176]، بۆیە لە نیوەی دووەمی سەدەی چواردە بەدواوە زانکۆکان بوونە ناوەندی دەرکەوتنی ڕەوتێکی ڕێکوپێك لە بزووتنەوە ڕیفۆرمخوازەکان کە زۆر بە توندی هێرشیانکردە سەر گەندەڵییەکانی کڵێسای کاتۆلیکی و دەسەڵاتی دونیایی پاپا و گەڕانەوە بۆ کتێبی پیرۆزیان کردە تاکە فریادڕەسی ئەم ڕەوشە.

(جۆن وێکلف) (John Wiclif) (1324؟ - ١٣٨٤ز )[177]، کە قەشەیەکی کاتۆلیکی و مامۆستایەکی زانکۆی ئۆکسفۆرد و هەڵــگــری بڕوانامەی دکتۆرا بوو لە بواری تیۆلۆجیادا، لە نیوەی دووەمی سەدەی چواردەدا بە ئاشکرا لە گوتارەکانیدا دەستیکرد بە پەردە هەڵماڵین لەسەر گەندەڵییەکانی کڵێسا، تایبەت دوای قووڵبوونەوەی کێشەی نێوان دەسەڵاتدارییەتی

---

(١٧٥) برتراند رسل، تاريخ الفلسفة الغربية...، ص ٢٨٢.

(١٧٦) سعيد عبدالفتاح عاشور، الجامعات في العصور الوسطى، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، د.ت.، ص٢٠١.

(١٧٧) لە هەندێك سەرچاوەدا ساڵی (١٣٣٠ز) بە ساڵی لەدایکبوونی دەزانن، (وێکلف) لەدایکبووی باکووری شاری یۆرك شایەرە، خوێندنی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد تەواو کردبوو، ساڵی (١٣٦٠ز) ماستەری لە بواری ئەدەبییات وەرگرتووە و ساڵی (١٣٦١ز) بووە قەشەی فـیلنگهام(Fillingham) ، لە ساڵی (١٣٧٢ز) بە دواوە تێکەڵ بە سیاسەت بووە و وەك نوێنەری حکومەتی ئینگلستان و بەشداری دانوستانەکانی پاپا و حکومەتی ئینگلستانی کردووە، لە ساڵی (١٣٧٤ز)، بەدواوە تا مردنی قەشەی شاری لۆتروۆرت (Lutterworth) بوو. بڕوانە:

Hurbertus Halbfas, Religionsunterricht in Sekundarschulen, Lehrehand buch and Dussseldorf (Patmos, S, 527 ff).

www.kerber.net.de/religion/reformation/wiclif.html; "Encyclopedia Britannca 2002", Expanded Edition DVD, John Wycliffe (1330-1338).

www.class-uh.edu/gbrown/philosophers/leibniz/britannicaPages/wicliffe.html.

ئینگلستان و پاپا لە ئەنجامی گواستنەوەی کورسی پاپایی لە رۆماوە بۆ شاری ئەڤینۆن (Avignon)[١٧٨] لە سەرەتای سەدەی چواردەدا [١٧٩]، کاتێك ئینگلستان بووە ناوەندی دەرکەوتنی هەوڵە دژە کڵێساییەکان، تایبەت لە دوا رۆژەکانی تەمەنیدا (وێکلف) زۆر بوێرانە بەگژ دەسەڵاتی بێ سنووری پاپا و گەندەڵییەکانی کڵێسادا چووەوە و پێیوابوو کە پاپا هیچی لە قەشەیەکی ئاسایی زیاتر نییە و لە توانای هیچ پیاوێکی ئاییندا نییە کە لە گوناهەکانی مرۆڤ خۆشبێت، بەڵکو ئەمە تەنها لە دەستی یەزداندایە و پاپا تەنها سەرۆکی رۆحی کڵێسایە و بە پێی دەقەکانی ئینجیل هیچ دەسەڵاتێکی دونیایی پێنەدراوە چونکە نە (سانت پترۆس) و نە هیچ نێردراوێکی تر ئەم دەسەڵاتەیان نەبووە[١٨٠]، هەروەها بە توندی هێرشیکردە سەر پسولەی لێبوردن و ژیانی راهیبەکان و پێیوابوو کۆکردنەوەی باج و سەرانە لە لایەن کڵێساوە هیچ بنەمایەکی نییە چونکە هیچ یەکێك لە نێردراوەکان ئەم کارەیان ئەنجامنەداوە و ئەو سەروەت و سامانەی کڵێساشی بە دوورکەوتنەوە لە پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی دانا و پێشیوابوو دەبێت ئەو سامانە لە خزمەتی کۆمەڵ و دەوڵەتدا بەکاربێت[١٨١].

(وێکلف) باوەڕی وابوو کە ئینجیل دەبێت تاکە سەرچاوەی هەڵهێنجانی شێوازی ژیانی کۆمەڵـــگـای مەسیحی بێت، بۆیە خوێندنەوەی ئینجـیلی لە لایەن هەموو کۆمەڵەوە زۆر

---

(١٧٨) ساڵی (١٣٠٥ز) کاردینالەکان لە ژێر فشاری (فیلیپی چوارەم)دا پاپا (کلمنت)یان هەڵبژارد و ساڵی (١٣٠٩ز) ئەم پاپایە کورسی پاپایی گواستەوە بۆ شاری ئەڤینۆن و بە تەواوی پاپا کەوتە ژێر کاریگەری و چاودێری پاشای فەرەنسا، بۆیە ئەم سەردەمە لە مێژووی کڵێسای کاتۆلیکیدا بە (دیلی بابلی Babylonian Capivity) ناسراوە. ئەم رەوشەش بووە مایەی ناقایلبوونی زۆرێك لە وڵاتانی رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەورووپا، بەتایبەتی ئینگلستان. بڕوانە:

Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 32; J.R. Hale and Others, Europe in the Late Middle Ages, Faber and Faber, London, 1965, PP.15-43.

(179) J.R. Hale and Others, Op. Cit., PP.15-43; J.A. Wylie, Op. Cit., Book (2), P. 101; Arthur P. Watts, Op. Cit., P.32.

(180) J.A. Wylie, Op. Cit., Book (2), P. 111.

(181)J.A. Wylie, Op. Cit., Book (2), P.111; Hubertus Halbfas, Previous Web Page; Cutting Edgeminister, medieval Church History.

www.revelation of john.com/medieval.htm.

بەگرنگ دەزانی هەر بۆیە وەریگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی[١٨٢]، ئەم هەڵوێستانەشی وایان لە پاپا (ئەربانی پێنجەم) کرد ساڵی (١٣٨٤ز) بەمەبەستی دادگاییکردن بانگهێشتی بکات بۆ رۆما، بەڵام بەهۆی زۆری تەمەنیەوە (وێکلف) نەیتوانی ئامادە بێت و هەر لەو ساڵەشدا کۆچی دواییکرد[١٨٣].

هەر لەم سەروبەندەدا بوو کە زنجیرەیەك دەنگی نارەزایی دژ بە کڵێسا لە ناوچەی بۆهیمیا (بەشێك لە کۆماری چیکی ئیستا پێکدەهێنێت) بەرزبوونەوە و رێخۆشکەرییان بۆ دەرکەوتنی یەکێك لە دیارترین و کاریگەرترین هەوڵە ریفۆرمخوازییەکانی کۆتایی سەدەنێوەنجییەکان کرد[١٨٤]، کە لەسەر دەستی (جۆن هس) (1369؟ John Huss - ١٤١٥ز) یەکێك لە مامۆستایانی زانکۆی پراگ و پیاوی ئایینی کلێسای کاتۆلیکی دەرکەوت[١٨٥].

(هس)، هەر زوو لە گوتارەکانیدا کە زۆربەیان بە زمانی چیکی بوون، قامکی بۆ گەندەڵییەکانی کلێسا رادەکێشا و توانی سەرنجی زۆرێك لە خەڵك بەلای خۆیدا رابکێشێت، بەڵام دوای دزەکردنی بەرهەم و بیروباوەڕکانی (وێکلف) بۆ بۆهیمیا و بلاوبوونەوەی بە زانکۆکاندا لە رێی خوێندکارە بۆهیمییەکانی زانکۆی ئۆکسفۆردەوە[١٨٦]، تایبەت دوای

(182) Hase and Moltby, Op. Cit., P. 259.

(183) J.C. Robertson, Op. Cit., P. 259.

(١٨٤) لە کۆتایی سەدەی سێزدە و سەرەتای سەدەی چواردەدا چەند دەنگێکی ریفۆرمخوازی وەك (کانراد ویلدنسینی (Canrad of Waldnassen)-و (میلی کریسمەر (Milie of Kremsier) -و (تۆماس ستیتنی- Thomas of Stitny) دەرکەوتن کە رۆڵێکی گەورەیان لە بەگژداچوونەوەی دەسەلاتی پاپا و کلێسادا هەبوو، بۆ پتر زانیاری بروانە:

W.T. Waugh, Op. Cit., PP. 211-213.

(١٨٥) هەندێ سەرچاوە ساڵی (١٣٧١ز) بە ساڵی لەدایکبوونی دەزانن، (جۆن هس) کوڕی دایك و باوکێکی گوندی(Husinee) ی ناوچەی باڤاریا (Bavaria) بوو و ساڵی (١٣٩٦ز) ماستەری لە بواری ئەدەبیات لە زانکۆی پراگ وەرگرتووە، دواتریش پلەی پرۆفیسۆری لە بواری تیۆلۆجیا پێبەخشراوە ساڵی (١٤٠٢ز) بووە سەرۆکی زانکۆ. بروانە:

W. T. Waugh, Op. Cit., P. 214; James E. Kiefer, The Biographical Sketches of Memorable Christian of the Past, John Huss, Priest and Martur, www.justus-anglican.org/resource/bio/7.html.

(186) W. T. Waugh, Op. Cit., P. 214.

پتەوبوونی پەیوەندییەکانی نێوان بۆهیمیا و ئینگلستان لە ئەنجامی خواستنی خاتوو (ئان-Ann)ی خوشکی (چارلسی چوارەم) لە لایەن (ریچاردی دووەم)ی پاشای ئینگلستانەوە[١٨٧].

(جۆن هس) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە بە توندی کەوتە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی (وێکلف) و جارێکی تر نۆژەنیکردنەوە، هەرچەندە (هس) لە زۆربەی بیروڕاکانیدا لەگەڵ (وێکلف)دا یەکدییان دەگرتەوە، بەڵام داواکاری و کارەکانی زۆر رادیکالتر بوون و باسەکانی بەوەندە نەوەستایەوە بەڵکو پەنجەی بۆ کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانیش راکێشا، وەك لەبەرچاوگرتنی رۆڵی جووتیار لە کۆمەڵدا و سەرچاوەی پێکەوەنانی سەروەت و سامان و ... هتد[١٨٨].

هەرچەندە (هس) بـــەم هەڵوێستەی توانی سۆزی بەشێکی کۆمەڵ بەلای خۆیدا رابکێشێت، بەڵام هاوکات ناحەز و نەیارێکی زۆری لە ناوەندە ئایینی و فکرییەکاندا بۆ پەیدابوو، بۆیە ساڵی (١٤١٤ز) دەستگیرکرا و دوای ئەوەی لە بۆچوونەکانی پاشگەز نەبووەوە لە ئەنجوومەنی کۆنستانسدا بەهێرتێکی لە قەڵەمدرا و رۆژی ٦ی تەمووزی (١٤١٥ز) سوتێنرا و سەرجەم بەرهەمەکانی قەدەغەکران[١٨٩]. بەڵام ئەم هەڵوێستەی کڵـێسا نارەزاییەکی گەورەی لە تەواوی وڵاتی بۆهیمیادا خستەوە و لایەنگرانی (جۆن هس) کە بە (هسییەکان - Hussites) دەناسران بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بوونە مایەی کێشە بۆ دەسەڵاتدارییەتی بۆهیمیا[١٩٠].

بەر لە کۆتایی سەدەی پازدە، جگە لەوەی کە چەند هزرڤان و هیومانیستێکی ئیتالی بە توندی رەخنەیان لە گەندەڵییەکانی کڵێسا دەگرت، هاوکات لە ئەنجامی کاریگەری رێنێسانسدا، چەند کەسایەتییەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی دەرکەوتن کە پەرۆشی چارەسەرکردنی ئەم رەوشەی کڵـێسا بوون، (جیرۆم ساڤونارۆلا) (Jerom Savonarola) (1452-1498ز)

---

(١٨٧) سعيد عبدالفتاح عاشور، الجامعات الاوروبية...، ص ٢٠٣؛ J. C. Robertson, Op. Cit., P. 256.

(١٨٨) بروانە: كمال مظهر أحمد، محاضرات ..، ص ١٧٣؛ J.A. Wylie, Op. Cit., Book (3), PP.159-168.

(189) R. Lodge, The Close of the Middle Ages (1273 – 1494), 5th Edition, London, 1935, PP. 216-217; James E. Kiefer, Previous Web Page; W.T. Waugh, Op. Cit., P. 221.

(١٨٩) بۆ زانیاری پتر بروانە:
PP.221-223. Stephenson, Op. Cit., PP. 423-424; W.T. Waugh, Op. Cit.,

کە راهیبێکی دۆمەنیکانی بوو و لەدایکبووی شاری (فیرارا-Ferrara) بوو، دیارترینیان بوو و یەکێك بوو لە کاریگەرترین پیاوە ئایینییەکانی ئیتالیا تایبەت لە شاری فلۆرەنسا[191] و بە توندی رەخنەی لە گەندەڵی و سەروەت و سامانی کڵێسا دەگرت، بوێرانە هێرش یدەکردە سەر شێوازی ژیانی پاپا (ئەلکساندەری شەشەم)[192]، هەر ئەمەش وایکرد ساڵی (١٤٩٧ز) دەستگیر بکرێت و ساڵی (١٤٩٨ز) یش بسوتێنرێت[193].

کڵێسای کاتۆلیکی لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا وێڕای رووبەڕووبوونەوە فیکرییەکان زۆر جار بە کردەوە دووچاری پێکداهەڵپژان دەبوو تایبەت دوای ئەوەی تادەهات هەڵوێستەکانی دژ بە بەرژەوەندی جووتیاران و هەژارانی شار روونتر دەبوون[194]. لۆلاردییەکان (Lollards) کە لە پیاوە ئایینییە هەژارەکان پێکدەهاتن و لە ژێر کاریگەری (وێکلف)دا بوون، پاش مردنی (وێکلف) بە شێوەیەکی بەرچاو تەشەنەیانکرد و بیروڕاکانیان بڵاوکردەوە کە بە توندی هێرشیاندەکردە سەر کڵێسا و ستەمی دەرەبەگایەتی و داوای یەکسانبوونی مرۆڤیان دەکرد و بیروڕاکانیان ناوچەی سکۆتلاندیشی گرتەوە[195]، بەکردەوە بەگژ کڵێسا و تەنانەت دەسەڵاتی دونیاییشدا چوونەوە و کێشەیەکی سیاسیی گەورەیان بۆ ناوچەکە نایەوە و تا دەسپێکی بزووتنەوەکەی (لوتەر) بەردەوامبوون و دووچاری جەور و ستەمێکی توندوتیژ هاتن لەلایەن هەریەك لە کڵێسا و دەسەڵاتی ئینگلستانەوە[196].

لە پاڵ سەرجەم ئەو هەوڵ و تەقەللا ریفۆرمخوازییانەدا کڵێسای کاتۆلیکی بۆ بەرگرتن لەم هەولانە و گێڕانەوەی پێگە و هەیبەتی کڵێسا، تایبەت دوای رووداوی "دابەشبوونی مەزن" (The Great Schism)ی ساڵی (١٣٧٨ز) کە کڵێسای کاتۆلیکی دابەشی دووبەش و دوو کورسی کرد، یەکێکیان لە رۆما و ئەویتریش لە ئەڤینۆن[197]، زۆرێك لە پیاوانی ئایینی و

---

(191) J. C. Robertson, Op. Cit., P. 272.

(192) Ernest Breisach, Op. Cit., P. 126; "The New Cambridge Modern History", Vol. 1, PP. 148-149.

(193)Schevill, Op. Cit., P.86.

(194) Ernest Briesach, Op. Cit., PP. 126-127.

(195)Ernest Briesach, Op. Cit., P. 127; Cutting Edgeministris, Previous Web Page.

(196) J.C. Robertson, Op. Cit., P. 252; Cutting Edgeministris, Previous Web Page.

(١٩٧) دوای ئەوەی ساڵی (١٣٧٧ز) پاپا (گریگۆری یازدە) کورسی پاپایی گێڕایەوە بۆ رۆما، دوای ساڵێك کۆچی دواییکرد کاردینالەکان پاپایەکی ئیتالییان بە نێوی (ئەربانی شەشەم) ەوە هەڵبژارد و کاردینالە

مامۆستایانی زانکۆکان بانگەشەی هەوڵی چارەکردنی گەندەڵییەکانی کڵێسایان دا و لەرێی بەستنی زنجیرە ئەنجوومەنێکی گەورەوە ئەم هەوڵەیان خستەگەڕ، کە لە مێژووی کڵێسای کاتۆلیکیدا بە (بزووتنەوەی ئەنجوومەنی – Councilor Movement) ناسراوە، وەك ئەنجوومەنی پیزا لە ساڵی (١٤٠٩ز)دا و ئەنجوومەنی کۆنستانس لە نێوان ساڵانی (١٤١٤ز) بۆ (١٤١٨ز) دا و ئەنجوومەنی فلۆرەنسا ساڵی (١٤٣٩ز)[198]. بەڵام کۆی ئەم هەوڵانە بە مردوویی لەدایکدەبوون و باری گەندەڵییەکانی کڵێسای قورستر دەکرد.

بەمجۆرە ئەگەرچی فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان نەکارابوون لە سازدانی هەلومەرجی بابەتی سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی گشتگیر و تەواوی ئەو هەوڵانە لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا مانەوە، بەڵام دواجار ئەم هەوڵانە بوونە بناغە دارێژەر و پاڵهێزی کارای پێگەیاندنی مەرجە بنەڕەتییەکانی تەقینەوەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی لە سەدەی شازدەدا.

---

فەرەنسییەکان لە ژێر فشاری ئەم پاپایەدا بە ناچاری گەڕانەوە بۆ فەرەنسا و کەسێکیان بە پاپا هەڵبژارد کە ناوی (رۆبەرت چنێڤی) بوو بە ناوی (کلمنتی حەوتەم) ەوە، بەمەش لە ساڵی (١٣٧٨ز) تا (١٤١٧ز) دوو کورسی پاپایی لە جیهانی کاتۆلیکیدا هەبوون، کە ئینگلستان و ئیمپراتۆریای رۆمانی پیرۆز و هەنگاریا و پۆڵەندا لایەنگرانی پاپای رۆما بوون و فەرەنسا و کاستڵ و ئەراگۆن و نابلس و سکۆتلاند لایەنگرانی پاپای ئەڤینۆن بوون. بڕوانە: Hase and Maltby, Op. Cit., P. 255.

(198) Ernest Breisach, Op. Cit., PP. 106-115.

## باسی یەکەم:

# فاکتەر و زەمینەخۆشکەرەکانی دەرکەوتنی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی لە سەدەی شازدەدا

بیرۆکەی ریفۆرم لە کڵێسای کاتۆلیکیدا رەگ و ریشەیەکی مێژوویی دوور و قووڵی هەبوو، فاکتەرە بنەڕەتییەکانی ئەم بزووتنەوەیە دەمێك بوو لە ناخی گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکاندا گەرای دانابوو، هەروەها ئەم بزووتنەوەیە وەك بیرۆکە (فیکرە) لە مێژبوو چەکەرەیکردبوو، دەکرێت بڵێین ئەم بیرۆکەیە بەر لە سەدەی شازدە لای دەستەبژێرێك لە هزرڤان و رۆشنبیران و پیاوانی ئایینی گەڵاڵە ببوو. بەڵام دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیە لە دەیەی دووەمی سەدەی شازدەدا وەك بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی – سیاسیی گشتگیر بۆ خۆی ئەنجامی تێکهەڵکێشبوونی کۆمەڵێك فاکتەری رێخۆشکەر بوو کە زادەی قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندنی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و فیکری ئەو رۆژگارەی کۆمەڵگای جیهانی کاتۆلیکی لە ئەوروپا بوون و زەمینەی دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیەیان رەخساند وەك لە خوارەوە باسیان لێوە دەکرێ.

یەکێك لە فاکتەرە بنەڕەتییەکانی رەخساندنی ئەم هەلومەرجە ئەو گۆڕانکارییە بوو کە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی ناوچەکانی جیهانی کاتۆلیکی ئەوروپای گرتەوە. دەرکەوتنی سەرمایەداری و زیادبوونی سەروەت و سامان و ژیانی خۆشگوزەرانی و رابواردنە دونیاییەکان رۆژ بە رۆژ کۆمەڵی بەرەو گیانێکی دونیاویستی دەبرد و لایەنی رۆحی و ئایینی بەسەر رەفتارە کۆمەڵایەتییەکاندا کاڵتر دەکردەوە، کۆمەڵگا پتر کەوتە هەڵپەی بەدەستهێنان و دابینکردنی بەرژەوەندییە ماددییەکان، لەسەر حیسابی نەریت و رەوشتە ئایینییەکان(١٩٩).

لە لایەکی تریشەوە سەرهەڵدانی چین و توێژی کۆمەڵایەتی نوێ، تایبەت چینی بۆرجوازی کە لەسەرەتای سەدەی شازدەدا پێینایە قۆناغی خەملینەوە، لە پاڵ ئەوەی کە باج و سەرانەی

(199) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 28.

کڵێسای بە تەگەرەی بەردەم بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆی دەزانی، هەمانکات چاوی تەماعی بڕیبووە سەروەت و سامانی کڵێسا و خوازیاری دەستبەسەرداگرتنی بوو، بۆ ئەوەی لە بواری بەسوود و قازانجدا بخرێنە گەڕ[٢٠٠]، هاوکات ئەو میرە دەرەبەگانەی کە زۆرێك لە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان لەدەستدابوو، وێڕای ئەوانەی بە تێپەڕبوونی کات بووبوونە سەرمایەدار بە توندی چاویان بڕیبووە سامان و زەوی و زاری کڵێسا[٢٠١]، جگە لەوەی لەو ڕۆژگارەدا شێوازی نوێی دابینکردنی بژێوی و کارکردن، کە بە تەواوی پشتی بە هەوڵ و توانای تاکەکەکان دەبەست، وایکردبوو تاکگەرایی و پێداگرتن لەسەر خود و ئیرادەی مرۆڤ ڕۆژ بە ڕۆژ لە هۆش و هزری تاکەکانی کۆمەڵدا بچەسپێ و وایان لێبکات هەوڵی ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی پێکبەستانەی پیاوانی ئایینی و کڵێســــا بدەن لە ژیانی ئایینیدا[٢٠٢]. سەرەڕای ئەوەی کە پەیڕەوی ئاڵۆز و جۆراوجۆربوون و فرەیی بۆنە و مەراسیمەکانی کڵێسای کاتۆلیکی بە تەواوی ببووە مایەی بێزاری ئەم چین و توێژە کۆمەڵایەتییە نوێیانە و بە مایەی بەفیڕۆدانی ئەو کاتانەیان دەزانی کە دەبوو لە بواری کار و پەیداکردنی سەروەت و ساماندا بەسەر ببرێت[٢٠٣]. هاوکات لەگەڵ گەشەکردنی بازرگانی و ڕۆڵی دراودا زۆرێك لە پرەنسیپەکانی کڵێسا کە ئاستەنگی بەردەم ســـــــوخواردن (الربا) بوون، بوونە مایەی بێزاری ئەم چین و توێژانە[٢٠٤].

لە لایەکی تریشەوە وەك ئەنجامێك بۆ ئەو گەشەسەندنانەی کە ژیانی ئابووریيان گرتەوە[٢٠٥]، سەرەتای سەدەی شازدە دەرەبەگ و میرەکان زۆر بە توندی جووتیارانیان

---

(200) Hayes, Modern Europe…, Op. Cit., P. 137.

(201) V.H.H. Green, Renaissance and Reformation. A Survey of European History between 1450 and 1600, 2nd Edition, Edward Arnold, London, 1977, PP. 116-117; Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 28.

(202) Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 374.

(٢٠٣) هاشم التكريتي، الاحوال العامة في المانيا عشية الاصلاح الديني، "مجلة كلية الآداب الانسانيات والعلوم الاجتماعية- بغداد"، العدد (٢٨) ، مطبعة معارف، بغداد، ١٩٧٥، ص ٣٤.

(204) V.H.H. Green, Op. Cit., P. 117.

(٢٠٥) لەسەرەتای سەدەی شازدەدا لە ئەنجامی زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان و قەرەباڵغبوونی شارەکان و بەرزبوونەوەی بەردەوامی بەها و نرخی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان، دەرەبەگ و خاوەن زەوییەکان پەنایان بۆ توندوتیژترین شێوازی بەکارهێنانی توانای جووتیارەکان برد و دەیان ڕێگایان لە داهێنانی کاری نوێ و زیندووکردنەوەی شێوازە کۆنەکانی بێگار و کار و زیادکردنی کرێی زەوییەکان لەم پێناوەدا گرتەبەر. بڕوانە:

دەچەوساندەوە، کە تا ئەوکاتیش زۆرینەی کۆمەڵیان پێکدەهێنا، ئەمەش تادەهات راپەڕین و یاخیبوونە جووتیارییەکانی بەگوڕتر دەکرد، بەجۆرێك کە لەو مەودا مێژووییەدا دەیەیەك نەبوو راپەڕینێکی جووتیاری بەخۆیەوە نەبینێت[206]، کە لە راستیدا یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی بەشی هەرە زۆری ئەو راپەڕینانە سەروگوێی پیاوانی ئایینی کلێسا و دێرەکانی دەگرتەوە، ئەوەتا ئەو بڕگەیە لە بانگەشەی راپەڕینی جووتیارانی ناوچەی (سپیرس – Spires) لە ئەڵمانیا ساڵی (۱۵۰۲ز) روونترین بەڵگەی سەلماندنی ئەم راستییەیە کە تیایدا هاتووە: "... دوای سەرکەوتنی تەواومان بەسەر میر و خانەدانەکاندا، هێرش دەبەینە سەر ئیپسکۆپس و سەرۆك دێرەکان و لەگەڵ سەرجەم قەشە و راهیبەکاندا و وەدەریان دەنێین یان دەیانکوژین"[207]. هەروەها لە شارەکانیشدا بەشی هەرە زۆری چین و توێژەکان بە چاوی رقەوە دەیانڕوانییە دەسەلآت و ئیمتیازەکانی پیاوانی ئایینی، تایبەت چینی بۆرجوازی کە بەردەوام هەڵپەی بەدەستهێنانی پێگەی سیاسیی دەکرد بۆ پاراستنی توانا ئابوورییەکەی کە رۆژ بە رۆژ لە برەوسەندندا بوو[208]. بەمجۆرە لە سەرەتای سەدەی شازدەدا کلێسای کاتۆلیکی بە تەواوی ببووە بەربەستی بەردەم بەرژەوەندییەکانی چین و توێژاڵە نوێیەکان و ویستە کۆمەڵایەتییەکان.

پێشکەوتنی فێربوون و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و پەرەسەندنی زمانە میللییەکان و رەهەندە جۆراوجۆرەکانی تری رێنێسانسیش سەرجەمیان مایەی گەشەپێدانی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و دەرکەوتنی جیهانبینییەکی نوێ و زەمینە خۆشکەرێکی تری ئەم بزووتنەوەیە بوون.

هیومانیستەکان سەرباری ئەوەی لەرێی زیندووکردنەوەی کەلتووری (پاگانیزم – الوثنية) ەوە کـۆمەڵـگایان ئاوێتە و ئاشنای زۆرێك لە ژیان و بیرکردنەوەی پاگانی و دژە ئایینی کرد، لە هەمانکاتدا بە رەخنە و سووکایەتیکردن بە تەواوی پێکهاتە فیکری و پراکتیکە کۆمەڵایەتییەکانی سەدە نێوەنجییەکان، هەروەها گرتنەبەری رێچکەیەکی نوێ لە بیرکردنەوە و

---

Euan Cameron, Early Modern Europe. An Oxford History, Oxford University Press, 2001, PP. 49-51.

(206) H.G. Koenigsberger and George L. Moss, Op. Cit., PP. 3-4.

(207 ) Quoted in: Johannes Jassen, History of the German People at the Close of the Middle Ages, Translated from German A.M. Christe, Vol. 4, Kegan Paul, Trench, Trubner and Co. LTD. Drden Hause, London, 1900, PP. 137-138.

(208 ) V.H.H. Green, Op. Cit., P. 117.

گەڕان بەشوێن نهێنییەکان و راڤەکردنی راستییەکانەوە، گورزێکی کوشندەیان لە شکۆمەندی و پێگەی کڵێسا وەشاند و پەردەیان لەسەر زۆرێك لە ساختەکاری و نابەجێی بیر و کرداری کڵێسا هەڵماڵی کە کارەکانی (لۆرینزۆ ڤالا) دیارترین نموونەیانە، بەمەش گومانێکی گەورەیان لە ناخی تاکەکانی کۆمەڵگادا بەرانبەر بە کڵێسا وروژاند(٢٠٩).

لەلایەکی ترەوە کنەکردن بە نێو سەرچاوە دێرینەکانی ئایینی مەسیحی و زیندووکردنەوەیان رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوو و لەم بوارەشدا چەندین پیاوی ئایینی و چەند پاپایەك ناو و ناوبانگیان دەرکرد، کە پاپا (نیقۆلای پێنجەم) (١٤٤٧-١٤٥٥ز) دیارترینیان بوو، هەر ئەویش بوو کتێبخانەی ڤاتیکانی دامەزراند کە برێکی زۆر لە سەرچاوە ئایینییە کۆنەکانی لەخۆدەگرت و چەندین زانا و بیریاری ئەو سەردەمەشی لەدەوری خۆی کۆکردەوە(٢١٠). جگە لەوەی، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدە بەدواوە چەند هیومانیستێك کەوتنە سەرقاڵی کۆکردنەوە و ژیاندنەوەی سەرچاوە دێرینەکانی ئایینی مەسیحی، بەتایبەتی لە ناوچەکانی باکوور وەك ئەڵمانیا و زەوییەنزمەکان کە بە (هیومانیزمی مەسیحی – Christian Humanism) ناسرا بوون(٢١١).

ئەم هیومانیستانە لە پاڵ ئەوەدا کە کۆمەڵگایان بەسەرچاوە راستەقینەکانی ئایینی مەسیحی ئاشناکرد، لە هەمانکاتدا پەنجەیان بۆ زۆرێك لە گەندەڵییەکانی کڵێسای کاتۆلیکی راکێشا و کۆمەڵگایان لێ وریاکردەوە و بە شێوازی جیاجیا بانگەشەی ریفۆرمیان لە کڵێسای کاتۆلیکیدا دەکرد.

(جۆهان ریخلن - Johann Rechlin) (1455-1522ز) هیومانیستێکی ئەڵمانی بوو کە چەند ساڵێکی تەمەنی لە ئیتالیا بردبووەسەر، پەیوەندی بە زۆرێك لە هیومانیستەکانەوە هەبوو و شارەزاییەکی باشی زمانی عیبری و (تەورات) بوو، لە بۆچوونەکانیدا بە ئاشکرا

---

(209) "Encyclopedia International", Vol. 15, PP. 336-337; George Clark, Early Modern Europe, from about 1450 to about 1720, 2nd Edition, Oxford University Press, London – New York – Toronto, 1966, P. 40.

(210) Edward Raymond Turner, Op. Cit., P. 152.

(٢١١) بڕوانە:

J. R. Hale and others, Op. Cit., PP. 437-440; Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 348.

هەوڵی کەمکردنەوەی بایەخی ڕۆڵی پێکبەستانەی پیاوانی ئایینی و کڵێسای لە ژیانی ئایینیدا دەدا[٢١٢].

یەکێکی تر لەو هیومانیستانە (جۆن کۆلیت - 1466-1519) (John Colet)ز) ی زانا و هیومانیستی ئینگلیزی و مامۆستای زانکۆی ئۆکسفۆرد و دامەزرێنەری قوتابخانەی (سانت.پۆل) بوو، کە بایەخێکی زۆری بە ژیاندنەوە و خوێندنەوەی سەرچاوە دێرینەکانی ئایینی مەسیحی دەدا، خوازیاری چاکسازی بوو لە کڵێسادا و ڕەخنەی لە زۆرێك لە بنەماکانی کڵێسای کاتۆلیکی دەگرت ، بە تایبەتی ڕەبەنی پیاوە ئایینییەکان[٢١٣].

(ئیرازمۆس - 1531 – 1465) (Erasmus)ز) یەکێکی تر بوو لە بەناوبانگترین ئەو هیومانیستانەی کە بە ڕەچەڵەك هۆڵەندی بوو، بەڵام زۆربەی ژیانی لە ئینگلستان و ئیتالیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بردبووەسەر، شارەزاییەکی باشی لە زمانی لاتینی و گریکیدا هەبوو، بانگەشەی ڕۆشنبیربوونی کۆمەڵی دەکرد بەتایبەتی لەڕووی ئایینییەوە و بەلایەوە گرنگ بوو بەشی زۆری کۆمەڵــگــا ئینجیل بخوێنێتەوە[٢١٤]، داواکاری ریفۆرم بوو لە کڵێسادا تا بتوانێت لەگەڵ پێشهاتە فیکرییە نوێیەکاندا بڕیکات، لەبەرهەمەکانیدا ڕاشکاوانە تانە و توانجی لە پەیڕەوی کڵێسا و کردارە کۆمەڵایەتییەکان دەدا و لە بایەخی ڕۆڵی کڵێسا و پیاوەکانی لە ژیانی ئایینیدا کەمدەکردەوە، ساڵی (١٥١٦ز) ئینجیلی بە هەردوو زمانی گریکی و لاتینی لە بەرانبەر یەکدا بلاْوکردەوە[٢١٥].

---

(٢١٢) بڕوانە:

D.H. Lawrence , Movements in European History, Oxford University Press, 1971, P. 206; Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, PP.67-69.

(٢١٣) بڕوانە:

Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, PP.163-170 ; English Bible History, John Colet. www.greatest.com/timline-english-bible-history/john-colet.html.

(214) James Harvey Robinson and Others, A General History of Europe From the Origins of Civilization to Present Time, Gin and Company, Boston – New York – Chicago – London, 1962, PP. 309-310.

(٢١٥) بڕوانە: سلامة موسى، حرية الفكر وابطالها في التأريخ، مزيدة ومنقحة، الطبعة الثانية، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٥٩، ص ١٥٤-١٥٥.

D.H. Lawrence, Op. Cit., P. 208 ; Johan Herman Randall, Op. Cit., P. 147.

دەرکەوتنی چاپ و چاپەمەنی جگە لەوەی وەرچەرخانێکی گەورەبوو بەسەر ژیانی فیکری کۆمەڵــگـای رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپادا هات، هەمانکات رۆڵێکی گەورەی لە ئاشناکردنی کۆمەڵ بە سەرچاوە راستەقینەکانی ئایینی مەسیحی و کتێبی پیرۆز لە رێی لەچاپدان و بلاوکردنەوەیان بە زمانە جیاجیاکان بینی، لە سەرەتای سەدەی شازدەدا نزیکەی (٤٢) جۆری دەستنووسی کتێبی پیرۆز و چەندین بەشی تەورات و دەقەکانی تریش لە چاپدران[٢١٦]، بەمەش ئەم سەرچاوانە کەوتنە بەردەستی بەشی زۆری کۆمەڵــگـا و بەو راستییانە ئاشنابوون کە چەند سەدەیەك بوو کلێسا لێی زەوت کردبوون. وێڕای ئەوەی چاپەمەنی رۆڵێکی بەرچاوی لە بلاوکردنەوەی بیروڕای ریفۆرمێستەکان بە نێو کۆمەڵدا گێڕا و فاکتەرێکی راستەوخۆ بوو لە بە کۆمەلایەتیکردنی ئەم بزووتنەوەیەدا، بۆیە (لوتەر) بە (دوا بەخششی مەزنی یەزدان) وەسفی کردووە[٢١٧].

دۆزینەوە جوگرافییەکان وێڕای ئەوەی تەکانێکی گەورەی بە پرۆسەی دەرکەوتنی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان دا، هاوکات کرانەوەیەکی گەورەی بەسەر بیر و هۆشی مرۆڤی ئەوروپادا هێنا و بە چەندین ژیار و رۆشنبیری جیاواز ئاشنایکردن و بە تەواوی ئەو تێگەیشتنەی ریشەکێش کرد، کە کلێسای کاتۆلیکی تاکە سیستەمی راست و دروستی ژیانی مرۆڤایەتی بێت و زۆرێك لە دید و بۆچوونە خورافی و نازانستییەکانی کلێسای پوچەڵ کردەوە[٢١٨]، بەمەش هێندەی تر لە هەیبەت و متمانەی کلێسای کەمکردەوە.

تەوژمی پێشکەوتنە مەعریفی و زانستییەکان وەك لە بەشی یەکەمدا باسمانکرد، دەمێك بوو تەقەللا فەلسەفییەکانی ناچار کردبوو هەوڵی جیاکردنەوەی ئەرکەکانی عەقڵ و ئاین بدەن کە بە ئاشکرا (ولیەم ئۆکهامی) ئەو راستییانەی کە لەرێی ئەزموون و تاقیکردنەوە عەقڵییەکانەوە دەسەلمێندرێت، لە ئەرکەکانی ئاین جیادەکاتەوە، بەمەش سەرەتای هەوڵەکانی

---

لە عەرەبییەکەیدا جون هارمان راندل، المصدر السابق، ص ٢٢٩-٢٣٠.

(216) Edward Raymond Turner, Op. Cit., PP. 155-156.

(217) Merle Severy, The World of Luther, "The National Geographic Magazine", Vol. 164, No. 4, Copyright, National Geographic Society, Washington, 1983, P. 429.

(٢١٨) حسن شحاتة سعفان، الموجز في تاريخ الحضارة والثقافة ، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٥٩. ص٢٠٠.

Hayes, Modern Europe…, P. 134 .

زانست و مەعریفە بۆ رزگاربوون لە کۆنترۆڵی کڵێسا دەستپێدەکات، لە سەرەتای سەدەی شازدەشدا ئەم پێشکەوتنانە پەیتاپەیتا چەمکی نوێتریان دەسەپاند و تەنگیان بە شێوازی راڤەکاری و لێکدانەوەکانی کڵێسا هەڵدەچنی و لێکدانەوەی نوێتر و گونجاوتریان لە ئایین گەرەك بوو، تا ئەو هەموو لەنگی و لاسەنگییەی دید و بۆچوونەکانی راستبکاتەوە، بۆیە پێدەچێت هەوڵدانی کڵێسا بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ پێشهاتە فیکرییە نوێیەکاندا یەکێکی تر بێت لە هۆکارەکانی ئەم بزووتنەوەیە[٢١٩].

ئەو رووداوانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی چواردە بەدواوە رووبەڕووی کڵێسا بوونەوە، هێندەی تر ئەو دەزگایەیان لە هەیبەت داماڵی و زەمینەی دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیەیان سازاند. سەرجەم هەوڵ و تەقەللا ریفۆرمخوازییەکانی بەر لە سەدەی شازدە رۆڵێکی گەورەیان لە هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگا لە گەندەڵییەکانی کڵێسا بینی، سەرەنجام گورزێکی گەورە بوون بەر هێزی رۆحی کڵێسا کەوتن، لە رووی فیکریشەوە کاریگەرییەکی گەورەیان بەسەر پێشەنگانی ئەم بزووتنەوەیەوە هەبوو، کە (لوتەر) بە راشکاوی لەبەردەم نوێنەری پاپادا دان بەم راستییەدا دەنێت و رۆڵی (جۆن هس) بەرز دەنرخێنێت[٢٢٠].

هەمانکات (دابەشبوونی مەزن) و (بزووتنەوەی ئەنجوومەن) ی بارتەقای ئەو هەولانە و بگرە پتریش زیانیان بە دەسەلات و نفوزی کڵێسا گەیاند و ناچاریانکرد هانا بۆ پشتگیری دەسەلاتە دونیاییەکان ببات[٢٢١]، جگە لەوەی نەهامەتییەکی دارایی گەورەیان لێکەوتەوە، کە وایکرد کڵێسا لە سەرەتای سەدەی شازدەدا بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم زیانانە هێندەی تر زێدەڕۆیی لە بەکارهێنانی پسولەی لێبوردن (صکوك الغفران) و باج و سەرانە و مامەڵەکردن بە پۆستە ئایینییەکانەوە بکەن و پەنا بۆ سەپاندنی دەسەلاتی رەها لە ناوچەی رۆما و دەوروبەریدا ببات، کە ئەمەش پتر پاپاکانی وەك میرێکی هەرێمی لە ئیتالیا دەردەخست لەو کاتەدا کە تادەهات مەیلە ناوەندخوازییەکان بەگوڕتر دەبوون[٢٢٢].

---

(٢١٩) بروانە: الفريد نورث وايتهيد، مغامرات الافكار، ترجمة أنيس زكي حسن، مراجعة د. محمود أمين وتقديم د. عبدالرحمن خالد القيسي، دار مكتبة الحياة و مكتبة النهضة ، نشر بالاشتراك مع مؤسسة فرانكلين، بغداد – القاهرة – بيروت – نيويورك ، ١٩٦٠، ص ٢٣٧.

(220) Merle Severy, Op. Cit., P. 443.

(221) "Catholic Encyclopedia", Reformation, Previous Web Page.

(222) V.H.H. Green, Op. Cit., P. 110 ; Edward Raymond Turner, Op. Cit., P. 162.

بووژانەوەی مەیلە ناوەندخوازییەکان (الميول او النـزعة المركزية) و دەرکەوتنی چەند دەوڵەتێکی ناوەندی لە کۆتایی سەدەی پازدە بەدواوە هێندەی تر هەنگاوەکانی تەقینەوەی ڕەوشەکەی خێراتر کرد. کڵـێسای کاتۆلیکی بە درێژایی سەدە نێوەنجییەکان ئەو پەیوەندییە ڕۆحییە بوو، کە دانیشتوانی جیهانی کاتۆلیکی لە ئەورووپا بەیەکدییەوە گرێدەدا، بەو پێیەی هەمووان خۆیان بە هاووڵاتی ژێر سایەی ئەم دەزانی و وەلایان بۆ کڵـێسای کاتۆلیکی هەبوو، کڵـێسا پشت ئەستوور بەهێزە ڕۆحییەکەی بەردەوام لە هەوڵی کۆکرنەوەی هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و دونیاییدا بوو، هەرچەندە بە تەواوی لەم هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام بەدرێژایی سەدە نێوەنجییەکان کۆسپی گەورەی بەردەم سەربەخۆیی یەکجارەکی پاشا و دەسەڵاتە دونیاییەکان بوو، بە ڕادەیەکی زۆر لە دەستووەردان لە کاروباری ئەم دەسەڵاتانە ئازاد بوو، کە لە ڕێی پیادەکردنی مافەکانییەوە بەسەر کڵـێسای ئەو ناوچانەوە و کۆکردنەوەی باج و سەرانەکانی، هەروەها لە ڕێی سامان و زەوی و زارەکانی لەو ناوچانەدا رایدەپەڕاند[223].

بەڵام دەوڵەتە ناوەندییەکان لەگەڵ دەرکەوتنیاندا، کەوتنە هەوڵی بنەبڕکردنی دەستێوەردانی کڵـێسا لە کاروباریان و ڕزگاربوون لەو باجانەی کە کڵـێسا لە ناوچەکانیان کۆیدەکردنەوە و لە ناوچەکانی تردا خەرجدەکران، بەتایبەتی لە ئیتالیا، هەروەها چاویشیان بڕیبووە سامان و زەوی و زاری کڵـێسا کە لە باجە دونیاییەکان بەخشرابوون و لە هەوڵی دەستبەسەرداگرتنیدا بوون بۆ بەهێزکردنی توانای ئابووری دەوڵەتی ناوەندی[224]. جگە لەوانەش دەبوو لە پێناو سەپاندنی دەسەڵاتێکی ڕەهادا پاشاکان دەسەڵات و ئیمتیازی فراوانی پیاوانی ئایینی سنووردار بکەن[225]. بەمجۆرە سەرەتای سەدەی شازدە دەسەڵاتی گشتگیری کڵـێسا بەتەواوی بوو بە لەمپەری بەردەم دەسەڵاتی پاشاکان و ویستە کۆمەڵایەتییەکان، بۆیە لاوازکردنی ببوو بە پێویستییەکی مێژوویی.

---

(223) Schevill, Op. Cit., P. 91. ; "Encyclopedia International", Vol. 15, P. 337; Edward Raymond Turner, Op. Cit., P. 163.

(224) Louis Gottschalk and Donald Lach, Europe and The Modern World, Scott, Foresman and Company , Chicago – Atlanta – Dallas – New York, 1951, PP. 151-152 ; Edward Raymond Turner, Op. Cit., P. 163.

(٢٢٥) فردیناند شيفل، الحضارة الاوربية في القرون الوسطى وعصر النهضة ، ترجمة منير البعلبكي، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٥٢، ص ١١٩.

وێڕای هەموو ئەمانە، لە سەرەتای سەدەی شازدەدا وەك ئەنجامێك بۆ قەرەبووكردنەوەی زیانە داراییەكان و زیادبوونی پێداویستی و مەیل بۆ خۆشگوزەرانی، كڵێسا و پاپاكان گەیشتنە لوتكەی گەندەڵی، بۆیە (لوتەر) راشكاوانە دەڵێت : "لەژێر ئەم ئاسمانەدا لە دەسەلاتی رۆما گەندەڵتر و ناحەزتر نییە"[226]. هەر ئەمەشە وایكردووە ژمارەیەك لە سەرچاوەكان ئۆیاڵی ئەم بزووتنەوەیە بخەنە ئەستۆی ئەو پاپایانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدە بەدواوە پۆستی پاپایەتییان وەرگرت[227].

بەمجۆرە لەئەنجامی ئەم فاكتەرە رێخۆشكەرانەدا كۆمەڵگای جیهانی كاتۆلیكی لە ئەوروپا لە سەرەتای سەدەی شازدەدا جۆرێك لە نزیكبوونەوەی لەگەڵ بیروڕای ریفۆرمستان بەخۆوە بینی، كە دواجار بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینیی لە چوارچێوەی بزووتنەوەیەكی كۆمەلایەتی سیاسیی فراوان و گشتگیردا بەرجەستە كرد، كە لە خاكی ئەڵمانیا و بەكارەكانی (لوتەر) تەقییەوە.

(226) Martin Luther, Concerning Christian Liberty.
www.iclent.org/pub/resource/text/Wittenberg/luther/web/cclib-2.html.

(٢٢٧) عبدالعزيز رفاعي، الحضارة الاوربية الحديثة من عصر النهضة حتى نهاية القرن التاسع عشر، مكتب الجامعات للنشر، القاهرة، ١٩٥٩، ص ١٣٩ – ١٤٠.

## باسی دووەم:

# پێشەنگەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی

### تەوەرەی یەکەم: مارتن لوتەر و بزووتنەوەی ریفۆرم لە ئەڵمانیا

ئاشکرایە کە بێزاری و نارەزایی لە کڵێسا وەك پێشتر روونکرایەوە دیاردەیەکی گشتگیر بوو لە جیهانی کاتۆلیکی لە ئەوروپا و بەشی هەرە زۆری ناوچەکانی گرتبووەوە. بەڵام کۆمەڵێك فاکتەری بابەتی کە دۆزە ئابووری و کۆمەلآیەتی و سیاسیی و فیکرییەکە دەستەبەری کردبوون، ئەڵمانیا دەکەن بە لەبارترین شوێنی تەقینەوەی ئەم بزاڤە وەك بزاڤێکی کۆمەلآیەتی و سیاسیی ، بۆیە بەرلەوەی بچینە سەر باسی پێشەنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە بە گرنگی دەزانین ئەم هۆکارانە تاوتوێ بکەین.

هەندێك لە ناوچەکانی ئەڵمانیا هەر زوو وەك ناوەندێکی بازرگانی گرنگی نێوان رۆژهەلآت و رۆژئاوا دەرکەوت، بەمەش گەشەسەندنە ئابوورییەکان و ئەنجامە کۆمەلآیەتییەکانی کە پێشتر باسکراون خێرا ناوچەکانی ئەڵمانیایان گرتەوە[٢٢٨]. ئەگەرچی لە کۆتایی سەدەی پازدە بەدواوە لە ئەنجامی دۆزینەوە جوگرافییەکان و گۆرانی رێگا بازرگانییەکان زیانێکی گەورە بەر ژیانی ئابووری ئەڵمانیا کەوت، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لەو شارانەی وەك ئۆگسبرگ

---

(٢٢٩) بۆ زانیاری پتر بروانە: هاشم التكريتي، المصدر السابق، ص٢٠- ٢٢.

Robert – Hermann Tenbrock, A History of Germany, Translate from German Paul J. Din, Max Hueber, Munchen, 1968, PP. 82-84.

(Augsburg) و نۆرمبرگ (Nuremberg)[٢٢٩] و هەندێ شاری سەر رووباری راین تا ناوەڕاستی سەدەی شازدە وەك ناوەندێکی بازرگانی رۆڵی خۆیان لەدەستنەدابوو[٢٣٠].

بەلاّم ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە، کە سەرجەم هەرێم و ناوچەکان لە ئەڵمانیا بە یەك ئاست ئەم گەشەسەندنانە نەیگرتبوونەوە و پەیوەندییە بازرگانییە نێوخۆییەکان لاوازبوون. بازرگانی ناوچەکانی باشوور لەگەڵ شارەکانی ئیتالیادا بوو، بۆیە زۆر دەوڵەمەند بوون. ناوچەکانی باکووریش پتر وەك مەڵبەندێکی گواستنەوەی نێوان رۆژهەلاّت و رۆژئاوای ئەڵمانیا دەرکەوتبوون، بەلاّم پەیوەندییەکی بازرگانی ئەوتۆ لە نێوان ناوچەکانی رۆژهەلاّت و رۆژئاوای ئەڵمانیا لەئارادا نەبوو، ئەمەش رەوشێکی ئابووری پەرتەوازەی لێکەوتەوە کە لە توانایدا نەبوو قەوارەیەکی ئابووری یەکگرتوو لە ناوچەکەدا دابمەزرێنێت، ئەویش رەنگدانەوەیەکی گەورەی بەسەر دۆخە کۆمەلاّیەتی و سیاسییەکەوە هەبوو[٢٣١].

لەڕووی سیاسییەوە لە کاتێکدا گەشەسەندنە ئابووری و کۆمەلاّیەتییەکان لە فەرەنسا و ئینگلستاندا یەکێتی ولاّت و دەسەلاّتی ناوەندی لێکەوتەوە، کەچی لە ئەڵمانیا بووە مایەی قەتیس مانی بەرژەوەندییەکان لە چوارچێوەی هەرێم و میرنشینەکاندا و پەرتەوازەیی سیاسیی بەرهەمهێنا[٢٣٢]. ئەگەر بڕوانینە ئیمپراتۆریای رۆمانی پیرۆز کە ئەو کات تاکە دەسەلاّتی گشتگیر بوو لەو ناوچانەدا[٢٣٣]، لە سەدەی پازدەدا لە چەند دەسەلاّتێکی ناوچەیی سەربەخۆ پێکدەهات، کە بەردەوام لەسەر حیسابی لاوازبوونی ئیمپراتۆریا بەهێزتر دەبوون[٢٣٤].

میرەکان خاوەن دەسەلاّتێکی سەربەخۆی بەهێزبوون و بەردەوام لە هەوڵی خۆبەهێزترکردندا بوون، دەسەلاّتدارییەتی شارەکان هیچیان لەمان کەمتر نەبوو، لە بەرانبەریشدا هەریەك لە پیاوە ئایینییە گەورەکان و خانەدانەکان لە هەڵپەی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا

---

(٢٢٩) دەربارەی شوێنی جوگرافی ئەو شارانە بڕوانە: نەخشەی ژمارە (٢) لە پاشکۆکان ل١٧١ .

(٢٣٠) بڕوانە: هاشم التكريتي، المصدر السابق، ص٢٠ .

(٢٣١) بڕوانە: هاشم التكريتي، المصدر السابق ، ص ٢٤ - ٢٥.

(232) Robert – Horman Tenbrock, Op. Cit., P. 71-75; A.J. Grant, Op. Cit., P. 282.

(٢٣٣) لەو کاتەدا ئیمپراتۆریای رۆمانی پیرۆز گەیشتبووە ئەوپەڕی بێهێزی تەنانەت هەڵبژاردنی خودی ئیمپراتۆر لە ساڵی (١٣٥٦ز) بە دواوە کەوتە دەست حەوت میری ناوچە لۆکاڵییەکان. بڕوانە:
Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, P. 35.

(234) Robert – Herman Tenbrock, Op. Cit., PP. 72 – 75.

بوون[235]. هەریەك لەم دەسەلاتانەش بەهێزبوونی خۆی لەدەستدرێژیکردنە سەر بەرژەوەندی ئەوی تردا دەبینییەوە، بەمەش ئەم دەسەلاتانە لە ململانێ و ناکۆکی بەردەوامدا دەژیان.

هەر ئەم رەوشەش ببووە لەمپەری بەردەم بەرژەوەندی چین و توێژەکانی شار وەك بازرگان و خاوەن بانك و پیشەگەر و ... هتد، کە تامەزرۆی پێکەوەنانی دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێزبوون، هەروەها گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان لە لایەك، پێشکەوتنی چەکسازی و سوپا و داهێنانی بارود لە لایەکی تر گورزێکی کوشەندەیان لە رۆڵی دەزگای سوارچاکان وەشاند، بۆیە ئەمانیش دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێز و کەمکردنەوەی دەسەلاتی میرەکانیان بە یەکێك لە ئامانجەکانی خۆیان دەزانی[236].

بەجۆرە ئەم رەوشەی باسکرا ئەوە دەردەخات، کە لەو کاتەدا میرنشینەکانی ئەڵمانیا جگە لە ململانێی نێوان چینی چەوساوە و چینی چەوسێنەر لە ململانێیەکی توندوتیژی نێو چینی چەوسێنەری سەرەوەدا دەژیا.

سەرەڕای ئەوەی باری هەرە قورسی ئەم ململانێیە کەوتبووە سەر شانی چین و توێژەکانی خوارەوە لە جووتیار و هەژار و کرێکارانی شار، ئەمەش وایکرد ئەم چین و توێژانە لە ئەڵمانیا پتر لە هەموو ناوچەکانی تری ئەوروپا دووچاری چەوسانەوە بێن و لە ژێر باری زۆری و فرەچەشنی باجەکاندا بناڵێنن[237]، تەنانەت لە مافی سوودوەرگرتن لە بەخششە سروشتییەکانیش بێبەش بکرێن وەك چۆن ئەم بڕگەیە لە تێکستی بانگەشەی جووتیارانی شاری (سپیرس)ی ئەڵمانیا لە ساڵی (١٥٠٢ز) دا بە ئاشکرا گوزارشت لە رەوشی ژیانی جووتیاران دەکات، کە دەڵێت: " پێویستە دەسەلاتدارییەتییەکانی سەر زەوی لەم مافانە دابماڵدرێن وەك: دەیەك و بەشەشمەك و بێگار و تەواوی باجەکان نەمێنن، ئاو و دارستان و لەوەڕگاکان و بەیارەکان و راوی باڵندە و ئاژەڵی کێوی و ماسی بۆ هەموو کەس ئازاد بکرێت"[238].

---

(235) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, P. 36.

(٢٣٦) هاشم التكريتي، المصدر السابق، ص ٢٨؛ كمال مظهر احمد، محاضرات ....، ص ١٧٥؛ عبدالعزيز الرفاعي، المصدر السابق، ص ١٤٦ - ١٤٧؛ Daniel Waley, Op. Cit., P. 262.

(٢٣٧) كمال مظهر احمد، محاضرات ....، ص ١٧٥.

(238) Quoted in : Johannes Janssen, Op. Cit., P. 138.

ئەم ستەمە زۆرە لە لایەك، کاریگەری (هسیەکان) بەسەر جووتیارانی ئەڵمانیاوە کە لە زۆربەی ناوچەکاندا بلاّوبوون لە لایەکی ترەوە[٢٣٩]، جووتیارانی ئەڵمانیای لە جووتیارانی سەرانسەری ئەوروپا بەگورتر کرد لە بەگژداچوونەوەی چەوسێنەران و هەر زوو دەستیان بەیاخیبوون و راپەڕین کرد و بەر لەهەموو ناوچەکانی تر هۆشیاری سیاسیی و کۆمەلاّیەتییان لا گەلاڵە بوو و لە نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەوە دەستیان بە خۆ رێکخستن و پێکەوەنانی کۆمەڵەی جوتیاری کرد[٢٤٠]، تا بەرپابوونی جەنگی گەورەی جوتیاری ساڵی (١٥٢٤ – ١٥٢٥ز) چەندین راپەڕینی جوتیاری توندوتیژیان ئەنجامدا[٢٤١]. ئەمانەی باسکران ئەو راستییە دەردەخەن کە لەو کاتەدا بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگای ئەڵمانیا پەرۆشی ریفۆرمێکی سیاسیی و پێکەوەنانی دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێز بوون و بە شێوازی جۆراوجۆر گوزارشتیان لێدەکرد، کە جگە لە توندوتیژی و راپەڕینەکان رۆشنبیرانیش ئەمەیان لە دووتوێی نووسینەکانیاندا دەخستەڕوو، کتێبی (چاکسازی ئیمپراتۆر سیگمۆند - Reformation of Kaiser Sigmund) کە ساڵی (١٤٣٨ز) نووسراوەتەوە و تا ساڵی (١٥٢٤ز) چەندین جار لە چاپدراوەتەوە، تیایدا هەردوو دەسەلاّتی ئایینی و دونیایی ئەو کاتە بە دەسەلاّتێکی گەندەڵ لە قەڵەمدەدا و یەکێك بوو لە دیارترین ئەو بەرهەمانەی کە رۆڵێکی گەورەیان لە رابوونی هەوڵە ریفۆرمخوازی و شۆرشگێڕییەکانی ئەڵمانیادا گێڕا[٢٤٢].

---

(٢٣٩) مەبەست لە هسییەکان لایەنگرانی (جۆن هس)ە لە بۆهیمیا، بۆ پتر زانیاریش بڕوانە
Janssen, Op. Cit.,, PP.127 – 128

(٢٤٠) ساڵی (١٤٣١ز) لە ناوچەکانی دەوروبەری ورمس نزیکەی (٣٠٠٠) جووتیار بە چەکەوە راپەڕین، هەر لەو سەروبەندەدا بۆ یەکەمجار هەوڵی دامەزراندنی کۆمەڵە و دیاریکردنی دروشمیان دا کە دروشمی (پێویستە جووتیاران قەیتانی پێلاّوەکان توندکەنەوە) هەڵبژارد کە دواتر بوو بە رێبازێك بە ناوی (بوندشچا - Bundschuh)ەوە بڕوانە. Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, PP. 101-106 :

(٢٤١) جگە لە بزاڤە جووتیارییەکان تەواوی چینە هەژارەکانی تریش لە شارەکاندا دەستەوەستان نەبوون، بەڵکو لە سەرەتای سەدەی شازدەدا لە ناوچەکانی ئەڵمانیا و زویسەنزمەکان، هەژارانی شار چەند راپەرینێکیان ئەنجامدا، کە یەکێك لە چالاکترینیان ساڵی (١٥١٤ز) لە ناوچەی ڤێتەنبرگ (Wittenberg) بە ناوی کۆنرادە هەژارەکان (Poor Conrad) تەقییەوە کە سەرەتا پەیوەندی بە جووتیارانیشەوە هەبوو، بەلاّم دواتر تەنها هەژارانی شاری لەخۆ گرت. بڕوانە.Johannes Janssen, Op. Cit., P. 140 :

(242) Johannes Janssen, Op. Cit., PP. 132-133.

ئەم بارودۆخە سیاسییەی باسکرا کڵێسا و پاپاکانی لە ئەڵمانیا دەستواڵاترکرد لە کۆکردنەوەی پارە و پول، تایبەت دوای بەهێزبوونی دەسەڵاتی ناوەندی لە ئینگلستان و فەرەنسا و کەمبوونەوەی بەرژەوەندییەکانی لەو وڵاتانەدا، پاپا و پیاوەکانی قورسایی کارەکانیان خستە ناوچەکانی ئەڵمانیا، ئەمەش وایکرد کە کڵێسا لە ئەڵمانیا لە سەرجەم ناوچەکانی تر گەندەڵتر دەرکەوێت و هەر زوو ناڕەزایی لە دژی کۆکردنەوەی پارە و پولی ئەڵمانیا و خەرجکردنی لە ئیتالیا دەربڕن[243]. بۆیە بێ هۆ نەبوو کە دەسپێکی کارەکانی (لوتەر) بە بەگژداچوونەوەی یەکێك لە پیاوانی پاپا دەستیپێکرد کە ناوی (تیتزل - Tetzel) بوو، ئەو کابرایە زۆر چلێسانە کەوتبووە فرۆشتنی پسولەی لێبوردن لە ئەڵمانیا و کۆکردنەوەی پارە و پول بۆ بیناکردنەوەی کڵێسای (سانت . پترۆس) لە رۆما[244].

هاوکات لە سەدەی پازدەوە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و زیادبوونی فێرگە و قوتابخانەکان ناوچەکانی ئەڵمانیا رابوونێکی فیکری گەورەی بەخۆیەوە بینی، تایبەت دوای دەرکەوتنی رکابەرایەتی نێوان بۆرجوازییەکانی شار و میرەکان لەم بوارەوە، وێرای زۆربوونی ژمارەی زانکۆکان کە لە نێوان ساڵانی (١٣٨٤ - ١٥١٧ز)دا نزیکەی حەڤدە زانکۆی نوێ لە ناوچەکانی ئەڵمانیا کرانەوە[245].

ئەمە وێرای ئاوێتەبوونی کاریگەری هیومانیستەکانی باکوور بە رەوشەکەوە لەو سەروبەندەدا کە هێندەی تر هەلومەرجەکەی لە ئەڵمانیا بۆ تەقینەوە گونجاوتر کرد، کە لەو کاتـــــەدا جگە لە (ریخلن) و (ئیرازمۆس) ، (ڤـۆن هوتن - Von Hutten)یش (١٤٨٨ – ١٥٢٣ز) رۆڵێکی گەورەی لەم رووەوە بینی. (هوتن) کە شاعیر و هیومانیستێکی ئەڵمانی بوو، خاوەن رۆشنبیرییەکی فراوان بوو، زانیارییەکی باشیشی لە زمانی لاتینیدا هەبوو، رۆڵێکی گەورەی بینی لە رابوونی هەستی نیشتیمانپەروەری لە ئەڵمانیا و بە ئاشکرا خەڵکی لە دژی کڵێسا هاندەدا و ئەو دەزگایەی بە مایەی پەرتەوازەیی و دووبەرەکی نێوان میرەکانی ئەڵمانیا و بە تالانبەری زێڕ و سامانی ئەڵمانیا لە قەڵەمدەدا[246].

(243 ) Daniel Waley, Op. Cit., P. 265.

(244) James Harvey Robinson and Others, Op. Cit., P. 311.

(245) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, PP. 53-56.

(246) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., PP. 75-76.

سەرباری هەموو ئەوانەی باسکران، دەرکەوتنی چەند ڕێگایەکی نوێ لە پەیڕەوکردنی ئایینی مەسیحی لە کۆتایی سەدەی چواردە بەدواوە لە ناوچەکانی ئەڵمانیا و زەوییەنزمەکاندا کە بە (بیروباوەڕی نوێ – Devotio Moderna) ناسراوە، ڕێخۆشکەرێکی تری تەقینەوەی ئەم بزووتنەوەیە بوون لە ئەڵمانیا، بەتایبەتی (ئۆگستینییەکان – Augustinian Ermites)[٢٤٧] و (برایانی ژیانی هاوبەش - Brethern of Common Life)[٢٤٨] کە لە دەرەوەی کڵێسای کاتۆلیکی دەرکەوتن و خەڵکێکی زۆریان لەدەور کۆبووەوە و لە بۆچوونەکانیاندا پێداگرییان لەسەر تاکگەرایی لە پەیڕەوی ژیانی ئایینی دەکرد و کاریگەرییان بەسەر خودی (لوتەر)ەوە هەبوو، کە بۆخۆی ڕاهیبێکی ئۆگستینی بوو[٢٤٩].

لە ئەنجامی ئەم فاکتەرانەدا ناوچەکانی ئەڵمانیا بوو بە لەبارترین خاکی تەقینەوەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی خاوەن مۆرکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کە خۆی لە خۆیدا یەکەم جەنگ و شۆڕشی گەورە و ڕاستەقینە بوو لە دژی سیستمی دەرەبەگایەتی.

## مارتن لوتەر (Martin Luther)

(مارتن لوتەر) ساڵی (١٤٨٣ز) لە خێزانێکی جووتیاری ناوچەی (ئایسلبین – Eisleben) لەدایکبووە. باوکی لە کانە کانزاییەکانی ئەو ناوچەیە کرێکار بووە[٢٥٠]، بەمەش

---

(٢٤٧) ڕەوتێکی سۆفیگەری بوو لە کۆتایی سەدە نێوەنجییەکاندا لە ناوچەکانی ئیتالیا و ئەڵمانیا سەریهەڵدا، بە توندی پابەندی ژیانی هەژاری و خواپەرستی بوون، بە زۆربەی ناوچە و شارە گەورەکانی ئەڵمانیادا بڵاوبووبوونەوە و زۆر هاندەری خوێندن و فێربوون بوون و زۆرێك لە پاپاکان هەوڵیاندا بیانخەنە چوارچێوەی دێرەکانی دییەوە، بەڵام بێئاکام بوو تا دواجار پاپا (ئەلکساندەری شەشەم) لەم هەوڵەدا سەرکەوت . بڕوانە:
"The Cambridge Modern History", Vol. 2, P. 114.

(٢٤٨) ئەم ڕەوتە ئایینییە کە پتر ڕۆشنبیری بوو، بزووتنەوەیەکی ریفۆرمیستانە نەبوو بریتیبوو لە گۆڕانێك لە پەیڕەوی ئایینی کاتۆلیکی، لە چارەکی کۆتایی سەدەی چواردە لە لایەن – (Gerard Groot) (1340 1384ز) ەوە دەستپێیکرد، دواتریش لەسەر دەستی (Thomas Qkempis) (1380 – 1471ز) پەرەی پێدرا. بڕوانە: H.G. Koenigsberger and George L. Moss, Op. Cit., P. 102.

(249) Munro and Santag, Op. Cit., PP. 513-517; Daniel Waley, Op. Cit., P. 269.

(250) Albrecht Beutel, Luther's Life, "The Cambridge Companion to Martin Luther", Cambridge University Press, 2004, P. 3; James Harvey Robinson and others, Op. Cit., P.310.

(مارتن لوتەر) لەو کەشە دژوار و پڕ ناڕەزاییەی ژیانی جووتیار و کرێکارانی ئەو ناوچەیەدا ژیاوە و بۆ خۆشی سەرەتاکانی ژیانی بە هەژاری بەسەربردووە و تەنانەت یەکێك بووە لەو خوێندکارانەی کە لە پێناو دابینکردنی خەرجی خوێندنەکەیدا لە کڵێسا و سەر شەقامەکاندا گۆرانی گوتووە[٢٥١]. ئەمانە لە لایەك، مامەڵەی توند و بێبەزەییانەی مامۆستاکانی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی خوێندندا لە لایەکی دی[٢٥٢]، کاریگەر بوون لە ڕەخساندنی کەسایەتی سەرسەخت و ناخێکی تووڕەی وەك (مارتن لوتەر).

فێربوون و خوێندنەوەی بەردەوامی ڕەگەزێکی تری سازدانی کەسایەتی شۆڕشگێڕانە و بە ئاگای (لوتەر) بوون[٢٥٣]، چونکە (لوتەر) هەر لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە لە قوتابخانەی (مانسفلد – Manisfeld) دەستی بەخوێندن کردووە و دواتریش لە (ماگدبرك – Magdeburg) و (ئیسنك – Eisenach) ، تا لە ساڵی (١٥٠١ز) دا دەچێتە زانکۆی ئێرفۆرت (Erfurt) و لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیشدا بڕوانامەی ماستەر لە بواری هونەرە

---

(251) “The Cambridge Modern History”, Vol. 2, P. 109.

(252) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 1, P. 194.

(٢٥٣) د. الانبا یوحنا قلتة، لە میانەی باسکردنی کاریگەری فیکری ئیسلام لە ڕێنێسانس و فیکری ڕۆژئاوا ئاماژە بەوە دەکات کە (لوتەر) بە فیکری موعتەزیلە و ئیسلام کاریگەر بووە و دەڵێت هەر لە سەدەی سێزدەوە قورئان وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی لاتینی و دواتریش زمانەکانی تری ئەوروپا، بەمەش پێیوایە کە (لوتەر) بەر لە بزووتنەوەکەی قورئانی خوێندۆتەوە. "المسیحیة والالف الثالثة"، دار المصر المحروسة، القاهرة، ٢٠٠٢، ص١٢٣. بەڵام د. محمد محمد صالح باسی ئەوە دەکات کە سەرچاوەیەکی وای لەبەردەستدا نییە ئاماژە بە کاریگەری عوسمانییەکان بەسەر (لوتەر)ەوە بکات و باسی ئەوە بکات کە (لوتەر) قورئانی خوێندبێتەوە تەنها ئەوەی کە (رولاند بینتون) ئاماژە بەوە دەکات کە (لوتەر) لە گفتوگۆی لەگەڵ (جۆن نیك) باسی دەستوور و حکوومەتی تورکەکانی کردووە. محمد محمد صالح، تأريخ أوربا عصر النهضة وحتى الثورة الفرنسية (١٥٠٠-١٧٨٩ز)، مطبعة دار الجاحظ للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٨٢، ص ١٨٥. بەڵام ئەگەرچی ناکرێت نکۆڵی لە کاریگەری فیکری ئیسلام بەسەر ڕێنێسانسدا بکرێت، کەچی پێناچێت کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر (لوتەر) هەبووبێت، چونکە ئەو کات چەندین بۆچوونی لە موعتەزیلە پێشکەوتووتر لە ئەوروپا لەئارادا بوو، بیروڕاکانی (لوتەر) بۆخۆی ڕەنگدانەوەی ئاسایی بارودۆخی سەردەمەکە بوون، جگە لەوەی (لوتەر) سەرەتا تەنها وەك هێزێکی سیاسی و لە ڕوانگەی دەوڵەتی عوسمانییەوە دەیڕوانییە ئیسلام، بەڵام لە ساڵی (١٥٤٢ز) دا نوسخەیەکی لاتینی لە قورئان دەستدەکەوێت و لێرەوە لەسەر ئەم ئایینە قسەی کردووە. لودفیغ هاغمن، المسیحیة ضد الاسلام. حوار انتهی الی الاخفاق، ترجمة محمد جدید، مراجعة زیاد متي، تقدیم رضوان السید، قدمس للنشر والتوزیع، دمشق، ٢٠٠٤، ص ١٣٩-١٤٢.

ئازادەکان بەدەستدێنێت و دواتریش لە ساڵی (١٥٠٥ز) دا دەست بە خوێندنی یاسا دەکات[٢٥٤]. جگە لەوانە بایەخێکی بەرچاو بە خوێندنەوەی بەرهەمە کلاسیکییەکانی باوکانی کڵێسا بەتایبەتی (سانت . ئۆکستین)[٢٥٥] و سکۆلاستییەکان بەتایبەتی (ولیەم ئۆکهامی) و (تۆماس ئەکیۆنس) و نامەکانی (سانت . پۆل) دەدا[٢٥٦].

خوێندنی لە زانکۆی ئێرفۆرت رۆڵێکی گەورەی دەبێت لە ئاراستەکردنی ژیانی فیکری و ئایینی (لوتەر)، ئەم زانکۆیە لە ساڵی (١٣٩٢ز)دا دامەزرابوو، یەکێك بوو لە زانکۆ گرنگەکانی ئەو کاتەی ئەڵمانیا و ناوەندێکی گرنگی بیرورا جیاوازەکانی وەك: هیومانیستەکان و سکۆلاستییەکان و راڤەکارانی ئینجیل و دژە کڵێساییەکان بوو، (مارتن لوتەر)یش بۆ خۆی باسیکردووە کە جارجارە دەنگێکی بەهێزی دژە کڵێسایی لەم ناوەندە بلاّودەبووە و[٢٥٧]، ئەم بیروڕایانە ئەگەرچی بۆ ئەو سەردەمە شتێکی نوێ نەبوون، بەلاّم بۆ لوتەرێك کە لە گوندەوە روویکردۆتە زانکۆ و لە خێزانێکی کاتۆلیکی ئاساییدا ژیاوە و پێیوابووە کڵێسا خانەی خودایە و ئیپسکۆپسەکانی رۆماش باوکی ئەم خانەیەن، ئەم بیروباوەڕانە نامۆ بوون، بۆیە هەر زوو گومانێکی گەورە لە ناخی (لوتەر)دا دروستدەکەن و تووشی تەنگژەیەکی دەروونیی دەکەن بە جۆرێك کە مرۆڤ بە رادەیەك بە ناپاك بزانێت کە لێبوردنی لە لایەن خوداوە مەحاڵ بێت، هەر

---

(254) Albrecht Beutel, Op. Cit., P. 4; Merle Severy, Op. Cit., P. 433.

(٢٥٥) ئارلیۆس ئۆگستین (٣٥٤ – ٤٣٠ز) لە ناوچە رۆژهەلاّتییەکانی ئیمپراتۆریای رۆما، لە باکووری ئەفریقیا لەدایکبووە، لەسەردەمێکدا ژیاوە، کە ئیمپراتۆریا لە گەرمەی گێژاوە سیاسی و کۆمەلاّیەتی و فیکرییەکاندا بووە، لە تەمەنی (٣٠) سی ساڵییەوە دەبێت بە مەسیحی دوای ئەوەی بە زۆرێك لە ئاین و رەوتە فەلسەفییەکانی ئەو سەردەمەدا گوزەر دەکات، خاوەن رۆشنبیرییەکی فراوان بووە و یەکێکە لە دیارترین دامەزرێنەرانی تیۆلۆجیای کاتۆلیکی و سەرەتای سەدە نێوەنجییەکان، (شاری خوا (The City of God – یەکێکە لە گرنگترین بەرهەمەکانی. بڕوانە:

"Encyclopedia International", Vol. 2, PP. 194-195

(256) Albrecht Beutel, Op. Cit., P. 5; Philip Malancthon, A History of the Life and Action of the Very Revere Dr. Martin Luther, Part One.

www.iclent.org /pub/ resources/text/Wittenberg / melan/lifea-01. txt.

(257) "The Cambridge Modern History", Vol.2, P. 111.

ئەو پرسی لێبوردنەش بوو کە دواجار (لوتەر) بەرەو ژیانی رەبەنی دەبات و لە ساڵی (١٥٠٥ز)[٢٥٨] دا لە یەکێك لە دێرە ئۆگستینییەکانی شاری ئێرفۆرت دەبێت بە راهیب[٢٥٩].

لێرەوە (لوتەر) بەپێچەوانەی ویستی خێزانەکەی دەست لە خوێندنی یاسا هەڵدەگرێت و دەست بە خوێندنی تیۆلۆجیا دەکات تا بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا لەم بوارەدا بەدەستدێنێ، لە ساڵی (١٥٠٩ز)ش بەدواوە دەبێتە مامۆستای تیۆلۆجیای زانکۆی تازەکراوە لە ڤیتەنبرگ (Wittenberg)[٢٦٠].

کنەی بەردەوامی بە نێو نامەکانی (سانت . پۆل)دا و قووڵبوونەوەی لە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆزدا (لوتەر)یان زیاتر لە ژیانی سادە و ساکاری سەرەتای مەسیحییەت بە ئاگا دەهێنایەوە، بۆیە کاتێك لە ساڵی (١٥١١ز)دا سەردانی رۆمای کرد و لە نزیکەوە چاوی بە ژیانی پاپا و پیاوانی ئایینی کەوت، زۆر سەری سوڕما، لێرەوە تۆوی نارەزایی لە دژی کلـێسای کاتۆلیکی لە ناخی (لوتەر)دا چەکەرەیکرد[٢٦١]، هەر لە ساڵی (١٥١٢ز)ەوە دەست بە نووسینە تیۆلۆجییەکانی دەکات، ئەگەر چی تا ناوەڕاستی ساڵی (١٥١٦ز) وەك کاتۆلیکییەك بیری دەکردەوە، بەڵام لەوێ بەدواوە لەرێچکەی کاتۆلیکی لاڕێ دەبێت و دەستدەکات بە رەخنەگرتن لە پسولەی لێبوردن و ساڵی (١٥١٧ز)یش بە ئاشکرا هێرشدەکاتە سەر تیۆلۆجیای سکۆلاستی[٢٦٢].

هەر لە ساڵی (١٥١٧ز)دا و لەرووبەڕووبوونەوەی (تێتزل)دا کە پێشتر باسکراوە، بە کردەوە هەنگاوە ریفۆرمخوازییەکانی (لوتەر) دەستپێدەکەن، دواتریش لە رێی ئەو (٩٥) بەندەی کە

---

(٢٥٨) د. محمد محمد صالح، دەڵێت (لوتەر) لە زانکۆ وەك راهیبێك دەرچوو، بڕوانە : محمد محمد صالح، المصدر السابق، ص ١٨٠، بەڵام (لوتەر) لە زانکۆوە و لە ساڵی (١٥٠٥ز) بەدواوە دەبێت بە راهیب، واتە دوای تەواوکردنی زانکۆ و قۆناغی بەکالۆریۆس ژیانی رەبەنی دەست پێدەکات.

(259) "The Cambridge Modern History", Vol. 2, PP. 111,114.

(٢٦٠) جورج طرابيشي، المصدر السابق، ص ٥٤٣؛ V.H. H. Green , Op. Cit., P. 118.

(٢٦١) مختصر تاريخ ألمانيا منذ أقدم الازمنة الى نشوب الحرب الاوربية الكبرى"، ترجمة ادارة الهلال، الطبعة الثانية، مطبعة الهلال، مصر، ١٩٢٤، ص ٥١؛ D.H. Lawrence , Op. Cit., P. 209; E.E. Kellett, A Short History of Religions, Victor Gollacz LTD, London, 1954, P. 305.

(٢٦٢) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الثالث من المجلد السادس، ص ١٥-١٦؛ "The Cambridge Modern History", Vol. 2, P. 112.

رۆژی (۱۵۱۷/۱۰/۳۱ز) لە دەرگای کڵـێسای ڤیتەنبرگ بە زمانی لاتینی هەڵیواسی[٢٦٣]، ڕاستەوخۆ ڕەخنە لە دەسەڵاتی ڕەهای پاپا و پسولەی لێبوردن و ڕۆڵی پێکبەستانەی کڵـێسا لە ژیانی ئایینی دەگرێت و تیایدا زۆرێك لەو بۆچوونانەی خستەڕوو کە دواجار بوونە هەوێنی بیروڕا تیۆلۆجی و کۆمەڵایەتییەکانی[٢٦٤] و دواتریش خێرا وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئەڵمانی و دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە ناوچەکانی ئەڵمانیادا هەبوو.

ئەم هەڵوێستەی (لوتەر) لایەنگرانی پاپای زۆر نیگەرانکرد و کەوتنە مشتومڕێکی تیۆلۆجی قووڵ لەگەڵیدا، تایبەت (کاردینال کۆجتان – Cardinal Cajtan) لە ساڵی (۱۵۱۸ز)دا و (جۆن ئێك – John Eck) ساڵی (۱۵۱۹ز) لە (لایپزیگ – Leipzig) و پاپایان لەم کردەوانەی (لوتەر) ئاگادارکردەوە[٢٦٥].

بەڵام بێزاری خەڵکی ئەڵمانیا لە کڵـێسا و ئاڵۆزی کێشەکانی ناوچەکە بە جۆرێك بوو کە ئیمپراتۆر (مەکسمیلیان) (۱٤۹۳ – ۱۵۱۹ز) بۆخۆی پاپا لە بەکارهێنانی توندوتیژی بەرانبەر (لوتەر) ئاگادار دەکاتەوە، هەروەها پاپا سەرەتا ڕووداوەکەی تەنها بە کێشەی نێوان ڕاهیبەکان دەزانی، هەموو ئەمانە وایانکرد کە (لوتەر) لە سەرەتادا ڕووبەڕووی هەڵوێستێکی توندوتیژ نەبێتەوە لە لایەن هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و دونیاییەوە[٢٦٦].

---

(٢٦٣) كهنة يسوع الملك في الموصل، لوثر وحركة الاصلاح، الحلقة الاولى، ١٩٦٤، ص٤ ؛
Robert – Herman Tenbrock, Op. Cit., P. 91.

(٢٦٤) بڕوانە:
Project Wittenberg : Disputation of Doctor Martin Luther on the Power and Efficacy of Indulgences. Martin Luther , 1517 – Adolph Spaeth, L.D. Read , Henry lacbs, et.Al. Trans and Eds.
www.iclent.org/pub/resources/text/wittenberg/luther/web/nintyfive.html.

(265) Timothy F. Lull, Luther's Writings, "The Cambridge Companion to Martin Luther", P.43; Preface Martin Luther, Preface to the Complete Edition Luther's Latin Work (1545), Translated Bro. Andrew Thornton.
www.iclent.org/pub/resources/text//wittenberg/luther/web/preflat-eng.txt.

(266) Arthur. P. Watts, Op. Cit., P. 45; E.E. Kellett, Op. Cit., P. 305; Preface Martin Luther, Previous Web Page.

سالّی (١٥٢٠ز)، ئەو سالّەیە کە (لوتەر) لەڕێی سێ تێزە بەناوبانگەکەیەوە هەریەك لە (نامەیەك بۆ میرانی نەتەوەی ئەلّمانیا – Address to the Christian Nobility of German Nition ) و (دیلەکانی بابل لە کلّێسای خودا – The Babylonian Captivity of The Christian Man) و (ئازادی مرۆڤی مەسیحی- The Freedom of the Christasin man)، بە ئاشکرا بزووتنەوەیەکی کۆمەلاّیەتی – سیاسیی لە دژی کلّـێسای رۆما رادەگەیەنێت و راشکاوانە تێڕوانینەکانی دەخاتەڕوو و هەنگاوە راستەقینەکانی جیابوونەوەی لە کلّـێسای کاتۆلیکی دەستپێدەکات. لە (نامەیەك بۆ میرانی ئەلّمانیا) دا، (لوتەر) بە ئاشکرا خەلّکی ئەلّمانیا بۆ بەگژداچوونەوەی کلّـێسا و پاپا و خۆرزگارکردن هاندەدات، میرەکان بە بەدیهێنەری ئەم رزگارییە دەزانێت و هەولّی وروژاندنی ویست و مەیلی پێکەوەنانی یەکێتی سیاسیی لە ئەلّمانیا دەدات، ئەلّمانییەکان بۆ پابەند نەبوون بە باج و سەرانەی کلّـێسا، کە دەچێتە باخەلّی بێگانەوە هاندەدات[٢٦٧]. لەم نامەیەدا بە ئاشکرا دەلّێت : " من دەمەوێ ئەو کەسانە هانبدەم و ئەو فیکرانە سازبدەم کە لە توانایاندایە یاریدەدەری نەتەوەی ئەلّمانیا بن بۆ رزگاری و بە مەسیحیبوونی راستەقینە"[٢٦٨].

لە (ئازادی مرۆڤی مەسیحی)یشدا، (لوتەر) هەولّیداوە لەرووی تیۆلۆجی و فیکرییەوە پشتگیری بۆچوونە سیاسیی و کۆمەلاّیەتییەکانی بکات و دەیەوێت کۆتایی بە گوێڕایەلّی خەلّکی ئەلّمانیا بۆ کلّـێسای کاتۆلیکی بهێنێت، بەو پێیەی کە مرۆڤی مەسیحی ئازادترین کەسە و ملکەچی کەسیش نابێت، ویستویەتی لە بایەخی پرەنسیپەکانی کلّـێسای کاتۆلیکی و کرداری باش کەمبکاتەوە بەو پێیەی کە دەستەبەرکردنی لێبوردنی خوا لە رێی ئیمانی باشەوە دەبێت نەك کردەوەی باش[٢٦٩].

---

(٣٦٧) بڕوانە : Project Wittenberg : An Open Letter to The Christian Nobility by Martin Luther (1520) , Proposals Reform. Part. I.

www.iclnet.org/pub/resources/text/Wittenberg.

(268) An Open Letter to the Christian Nobility, Previous Web Page.

(269) Concerning Christian Liberty.

www.iclnet.org /pub/resources/text/Wittenberg/luther/web/cclib.html.

له (دیلەکانی بابلی له کلێسای خودا)دا رەخنه له زۆربەی مەراسیم و پرەنسیپەکانی کلێسای کاتۆلیکی دەگرێت به حەوت نهێنییەکانیشەوه و تەنها (شامی خوایی – Tran substation - العشاء الرباني) و (راگیرکردن – Baptism) دەهێڵێتەوه[٢٧٠].

بەم کردەوانه (لوتەر) دەبێته ترسێکی راستەقینه لای کلێسای رۆما، بۆیه هەر لەو ساڵەدا بریاری (بێبەریبوون له کلێسا – Excommunicating) ی بەسەردا دەسەپێنن، کەچی (لوتەر) به سوتاندنی ئەم بریاره له بەردەم خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆی ڤێتەنبرگدا وەلامیان دەداتەوه، بەمەش هێندەی تر نیازه جیاخوازییەکانی دەسەلمێنێ[٢٧١]. هەر بۆیه ساڵی (١٥٢١ز) ئیمپراتۆر (چارلسی پێنجەم - Charles 5) (1519 – 1558ز) (لوتەر) بانگهێشتی ئەنجوومەنی شاری (ورمز - Wrmes) دەکات بۆ دادگاییکردن و داوای پاشگەزبوونەوەی لێدەکات لەو هەڵوێستانەی، بەڵام (لوتەر) ئامادە نابێت پاشگەزبێتەوه، بۆیه به دەرچوو له یاسا لەقەڵەمدەدرێت[٢٧٢].

بەمجۆرە ساڵی (١٥٢١ز) (لوتەر) له هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و دونیایی یاخیدەبێت و لێرەوه دەکەوێته ژێر زێرەڤانی (فرەدرێك سەکسۆنی – Frederick Saxony ) میری سەکسۆنیا و نزیکەی یەك ساڵ له (قەڵای ڤێتەنبرگ) له حەشارگەدا دەبێت و لەو ماوەیەشدا زۆرێك له بەرهەم و نووسینەکانی نووسیوەتەوه که وەرگێرانی (ئینجیل) بۆ سەر زمانی ئەڵمانی دیارترینیان بوو[٢٧٣].

بەمەش له ساڵی (١٥٢١ز) بەدواوه کارەکانی (لوتەر) له سنووری ناکۆکی کەسی دەچێتەدەر و لەبەرگی بزاڤێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا خۆیدەنوێنێت و هێنده نابات بەشێکی زۆری چین و توێژه ناقایلەکان کۆدەکاتەوه. جووتیاران به پرەنسیپه یەکسانیخوازییەکانی،

---

(270) Martin Luther , The Babylonian Captivity of the Church (1520) Translated. Albert. T. W. Steinhaeuser. www.ctsfw.edu/text/luther/babylonian/babylonian02.

(271) Merle Severy, Op. Cit., P. 448; E.E. Kellett, Op. Cit., P. 305

(٢٧٢) راس . ئی. دان و دیگرش، تأریخ تمدن وفرهنك جهان. پیوندهای فرانسوی زمان و مکان، ترجمة عبدحسین آذرنك،بەرگی سێیەم، ١٣٨٢ هەتاوی، ل ٧٦.

Katherine Leach,The German Reformation, Macmillan,London, 1991 ,PP. 24-25.

(273) Albrecht Beutel, Op. Cit., P. 11; Stephen J. Lee, Aspects of European History (1494-1789), 2nd Edition, Methuen, London and New York, 1986, PP. 20-21.

بۆرجوازییەکانیش بە پرەنسیپە تاکگەرایی و ئازادیخوازییەکانی، میرەکانیش بۆ دژایەتیکردنی دەسەڵاتی گشتگیر و بێگانەی هەر یەك لە پاپا (لیوی دەیەمی —Leo 10)ی ئیتالی و ئیمپراتۆر (چارلسی پێنجەم)ی ئیسپانی، سوارچاکەکان و زۆربەی پیاوانی ئایینی و بیریارە رادیکاڵەکانیش بوونە لایەنگری (لوتەر)[٢٧٤].

(لوتەر)یش هەر لە سەرەتاوە هەوڵی زامنکردنی پشتگیری تەواوی هێز و لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی داوە، بۆیە زۆر جار هەڵوێستی دژ بەیەك و دووفاقەیی لە بۆچوونەکانیدا دەردەکەوتن. بۆ نموونە لە (ئازادی مرۆڤی مەسیحیدا) دەڵێت: "مرۆڤی مەسیحی گەورەی هەمووانە و لە هەموو کەسێکی دی ئازادترە و ملکەچی کەسیش نابێت" کە لێرەدا وەك پێشتر گوتمان مەبەستی ملکەچ نەبوونە بۆ کڵێسای کاتۆلیکی، کە چی هەر لەوێدا دەڵێت: "خزمەتکارێکی گوێڕایەڵە، و ملکەچی هەموو کەسێکە"، لێرەشدا پاکانە بۆ دەسەڵات و سیادەی میرەکان دەکات، بۆیە (لوتەر) یەکڕیزی ئەم چینە کۆمەڵایەتییانەی زۆر مەبەست بووە، هەر ئەمەش وایکرد کە دوای سەرهەڵدانی راپەڕینی سوارچاکەکان بە سەرکردایەتی (فرانز ڤان سکینگن – Franz van Sickingen) و (ڤۆن هوتن) لە ساڵی (١٥٢٢ز) دا و بە مەبەستی هێورکردنەوەی رەوشەکە نامەیەکی بەناونیشانی "ئامۆژگاری مرۆڤی مەسیحی دژ بە توندوتیژی و راپەڕینە چەکدارییەکان" ئاراستەی کۆمەڵگای ئەڵمانیا دەکات، بەلام دوای ئەوەی هەوڵەکانی لەم بوارەدا بێئاکام دەبێت بە تەواوی هەڵوێستی بەرانبەر سوارچاکەکان دەگۆڕێت و پشتگیری میرەکان دەکات[٢٧٥].

بەمجۆرەش لەگەڵ رەوتی رووداوەکاندا تادەهات بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییە لێکجیاکان پێکداهەڵدەپژان و ئەو راستییە روونددەبووەوە کە ئەم هێزانە تەنها لە دژایەتیکردنی کڵێسا و رەتکردنەوەی رەوشەکەدا هاوبەش بوون، ئەمانە وا دەکەن (لوتەر) لە زۆرێك لە هەڵوێستەکانی پاشگەزبێتەوە و لە پێناو پاراستنی خۆی و بزووتنەوەکەیدا هانا بۆ توانای میرەکان ببات و پشت بکاتە زۆرێك لەو هێزانە، بۆیە هەر بەسێ ساڵ دوای راپەڕینی سوارچاکەکان و لە شۆڕشی گەورەی جووتیارانی ساڵی (١٥٢٤ – ١٥٢٥ز) و دوای ئەوەی ناتوانێت بە ئاشتی رەوشەکە

---

(274) Louis Gottshalk and Donald Lach, Op. Cit., P. 157; Robert – Hermann Tenbrock, Op. Cit., P. 96.

(275) Louis Gottshalk and Donald Lach, Op. Cit., PP. 159-160; Robert – Hermann Tenbrock, Op. Cit., P. 96; Albert Beutel, Op. Cit., P. 11.

هێور بکاتەوە، هەمان هەڵوێستی پێشووتر دووبارە دەکاتەوە و جووتیاران بە بەڵێنشکێن و چەتە و دز و بوختانکەر بە ناوی کتێبی پیرۆزەوە لە قەڵەمدەدات و میرەکان لە سەرکوتکردنەوەیان بەهەموو جۆرێك دەستوالآدەکات[٢٧٦]. هەر لە ساڵی (١٥٢٥ز)یشدا دەستبەرداری زۆرێك لە بیریار و رۆشنبیرە لایەنگرەکانی دەبێت، بەتایبەتی ئیرازمۆس[٢٧٧].

(لوتەر) ئەگەرچی تا مردنیشی ساڵی (١٥٤٦ز) لە بەرهەم و نووسین نەکەوت، بەلآم بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان ساڵەکانی (١٥٢٠ – ١٥٣٠ز) دا هێڵە سەرەکییەکانی بیروبۆچوونەکانی بەرجەستەدەکات. لە ساڵی (١٥٢٤ز) بەدواوە دوای ئەوەی کە زۆرێك لە میرەکانی باکوور و ناوەڕاستی ئەڵمانیا بە ئاشکرا لوتەریبوونی خۆیان رادەگەیەنن[٢٧٨]، لوتەریزم وەك ئایدۆلۆجیایەکی لێدێت بۆ ئەو میرانە لە دژایەتیکردنی ئیمپراتۆر و پاپا لە لایەك و میرەکانی باشوور لە لایەکی دییەوە و لە ساڵی (١٥٢٦ز) دا سوود لە سەرقاڵی ئیمپراتۆر بە جەنگی فەرەنسا و عوسمانییەکانەوە وەردەگرن و لە ئەنجوومەنی (سپیرس) دا ئەو مافە دەستەبەردەکەن کە هەر میرێك سەربشك بێت لە دیاریکردنی ئایینزای میرنشینەکەی[٢٧٩]، لە ئەنجوومەنی شاری (ورمز) ی ساڵی (١٥٢٩ز) یشدا لە رێی ئەو پرۆتێستەوە کە بۆ داکۆکی لە مافەکانیان نواندیان بەرانبەر بە ئیمپراتۆر پتر بەهێز دەرکەوتن[٢٨٠]، تا دواجار لە ساڵی (١٥٣٠ز)دا لە ئەنجوومەنی (ئۆگسبرگ – Agusburg) دوای ئەوەی (میلانگتن – Melanchthon)[٢٨١] بە ئامادەبوونی ئیمپراتۆر پوختەی بیروڕای لوتەرییەکانی خستەڕوو

---

(276) Martin Luther, May 1525, K.C. Session, Reformation and Authority, 1968, PP. 29-39. بەوەرگرتن لە Katherine Leach, Op. Cit., 1991, P. 28.

(٢٧٧) هەر چەندە ئیرازمۆس سەرەتا لایەنگری (لوتەر) بوو، بەلآم لە ساڵی ١٥٢٤ بە دواوە کۆمەڵێك کێشەی تیۆلۆجی کەوتە نێوانیان بەتایبەتی لەسەر ئازادی مرۆڤ، بڕوانە: Albert Beutel, Op. Cit., PP. 14-15.

(278) E.E. Kellett, Op. Cit., P. 309.

(279) James Harvey Robinson and Others, Op. Cit., P. 316.

(٢٨٠) هەر لەم رووداوەوە ئیدی ریفۆرمخوازەکان بە پرۆتیستانەکان ناسران وەك لە بەشی یەکەمدا باسکراوە.

(٢٨١) فیلیپ میلانگتن (١٤٩٧ – ١٥٦٠ز) لە ساڵی (١٥١٨ز) دا بوو بە یەکێك لە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆی ڤیتەنبرگ و هاورێیەکی نزیکی (لوتەر) بوو، خێرا کەوتە ژێر کاریگەری (لوتەر)ەوە. بڕوانە:

William V. Frame , Philip Melanchthon. The Academic Reformation, Victoria B.C., 2005, PP. 1-4. www.augsburg.edu/president/lecna.pdf.

که به (دانپێدانانی ئۆگسبرگ – Agusburg Confession) ناسراوه[٢٨٢]، به تەواوی پرۆتێستانتەکان لە کاتۆلیکەکان جیابوونەوە و لە ساڵی (١٥٣١ز) یشدا میرە پرۆتێستانتەکان هاوپەیمانیەتییەکیان بە ناوی (شمالکالدك – Schmalkldic ) بەست و لێرەوە تادەهات باری نێوان کاتۆلیك و پرۆتێستانتەکان گرژتر دەبوو و سەرەنجام ئاشووب و جەنگێکی ناوخۆیی درێژخایەنی لێکەوتەوە کە دواجار لە ساڵی (١٥٥٥ز) دا و بەپێی ئاشتینامەی (ئۆگسبرگ) کۆتایهات، دوای ئەوەی لوتەرییەکان چەند دەسکەوتێکی ئایینی و سیاسییان دەستەبەر کرد[٢٨٣].

**تەوەرەی دووەم: ئەلریك زوێنگلی (Ulrich Zwingli):**

وێڕای هەموو ئەو سازشکارییە لە بۆچوونەکانیدا و بە تێکڕای کەموکوڕییەکانەوە، کارەکانی (لوتەر) وەرچەرخانێکی گەورە بوون لە رەوتی خۆڕاپسکاندنی بزووتنەوەی فیکری و کۆمەڵایەتی لە جیهانی کاتۆلیکی ئەورووپادا، رێخۆشکەری دەرکەوتنی چەندین پێشەنگی رادیکالتر و بزووتنەوەی چالاکتر بوون لە مێژووی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینیدا.

بیروڕاکانی (لوتەر) زۆر بەخێرایی خزییە ناوچەکانی تری ئەورووپا و رەنگدانەوەی خۆی هەبوو، تایبەت لە ناوچەکانی سویسرای هاوسنوور لەگەڵ ناوچەکانی ئەڵمانیا، بۆیە سویسرا دەستپێشخەربوو لەم رووەوە و بەر لە ناوچەکانی تری ئەورووپا و دوای ئەڵمانیا وەك ناوەندێکی گرنگی بزووتنەوەی پرۆتێستانتی دەرکەوت.

ئەم بزووتنەوەیە لە سویسرا بە چالاکییەکانی (زوێنگلی) دەستپێکرد، کە پیاوێکی کاتۆلیك و گوتاربێژی شاری (زوێریخ – Zurich) بوو. (زوێنگلی) لە (١-١-١٤٨٤ز)دا لە ناوچەی (فلدهاوس – Wildhous) لە رۆژئاوای سویسرا لەدایکبووە، لە تەمەنی (١٠) دە ساڵییەوە چۆتە شارەکانی (بازل – Basel) و (بێرن – Bern)[٢٨٤] بۆ خوێندن و دواتر هەر بۆ

---

(282) Claue Beaufort Moss, the Christian Fifth. An Introduction to Dogmatic Theology, Morehouse, New York, – Gorham. Co., 1943, P. 229. www.orthodoxanglican.net/downloads/faith.pdf.

(283) Hayes and Cole, Op. Cit., P. 30; Arthur. P Watts, Op. Cit., PP. 50-53.

(٢٨٤) بۆ زانینی شوێنی جوگرافی ئەو شارانە بڕوانە نەخشەی ژمارە (٢) لە پاشکۆکان ل١٧١.

هەمان مەبەست بۆ ماوەی دوو ساڵ لە نێوان (١٥٠٠ -١٥٠٢ز) چۆتە شاری (ڤییەنا)[٢٨٥]، دوای گەڕانەوەشی بە دوو ساڵ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بواری ئەدەبدا وەرگرت، لە ساڵی (١٥٠٦ز)یشدا ماستەری لە بواری هونەر بەدەستهێناوە، لەهەمان ساڵیشدا بۆتە قەشەی شاری (گلاریس – Glarus)[٢٨٦].

(زوینگلی) هەر زوو لە ژێر کاریگەری هەندێك لە مامۆستاکانی ئاگاداریی سەبارەت بە بیروڕای هیومانیستەکان پەیداکرد، دواتریش لە شاری گلاریس بە چەند کەسێکیان ئاشنابوو، تایبەت (ئیرازمۆس) کە ساڵی (١٥١٥ز) یەکتریان ناسی و کارەکانی کاریگەرییەکی زۆریان کردە سەر هزر و بیرکردنەوەی (زوینگلی)، جگە لەوەی (زوینگلی) بایەخێکی زۆری بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی باوکانی کڵـێسا دەدا، بەتایبەت (سانت.ئۆگستین) و زمانی گریکی بەباشی دەزانی و هەوڵی فێربوونی زمانی عیبریشی دەدا[٢٨٧]، بەمەش (زوینگلی) یەکێك بوو لە پیاوە ئایینییە هەرە ڕۆشنبیرەکانی سەردەمی خۆی کە مۆرکێکی هیومانیستی بەسەر هزریدا زاڵبوو.

ساڵی (١٥١٦ز) کە تیایدا (زوینگلی) دەبێتە گوتاربێژی دێری (سانت . مریم) لە شاری (ئاینسدلن – Einsieden) کە کتێبخانەیەکی دەوڵەمەند و زۆرێك لە بەرهەمی هیومانیستەکان بەتایبەتی (ئیرازمۆس)ی تێدابوو، کاریگەری زۆریان بەسەر ژیانی فیکری (زوینگلی)یەوە دانا و هەر لەو ساڵەشدا ڕەخنەکانی لە هەندێك لە مەراسیم و پەیڕەوەکانی کڵـێسای کاتۆلیکی دەستپێکرد و ئاماژەی بە گرنگی گەڕانەوە بۆ ئینجیل کرد و سەرەتای ئاماژە ریفۆرمخوازییەکانی دەرکەوتن[٢٨٨].

(زوینگلی) سەرەتای چالاکییە دژە کڵـێسایییەکانی لە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە دەستپێکرد و ڕەخنەی لە دیاردەی بەکرێگرتەیی (المرتزقة) سوپای سویسرا دەگرت کە کڵـێسا ڕۆڵێکی

---

(285) Thomas M. Lindsay, A History of the Reformation, Vol. 2, 2nd Edition, Edinburgh – New York, 1951, PP. 24-27; "The Cambridge Modern History", Vol. 2, PP. 306-308.

(286) V. H.H. Green, Op. Cit., P. 159; Thomas M. Lindsay, Vol. 2, P. 26.

(٢٨٧) "موسوعة الاديان في العالم. الاصلاح الديني المسيحي"، ص ١١٣ – ١١٥؛
"The Cambridge Modern History", Vol.2, P. 308.

(٢٨٨) سعد رستم، المصدر السابق، ص ١٣٩ ؛ V.H.H. Green, Op. Cit., P. 159.

گەورەی تێدا دەگێڕا و بەشێکی زۆری لاوانی سویسرا دەبوون بە قوربانی ئەم بازرگانییە، دواتریش هێدی هێدی ڕەخنەکانی بەرەو گەندەڵییەکانی تری کڵێسا سەریاندەکێشا[٢٨٩].

بەڵام چالاکییە ڕاستەقینەکانی بۆ جیابوونەوە لە کڵێسا لە ساڵی (١٥١٨ز) دا بەکردەوە دەستپێدەکات دوای ئەوەی لە شاری (زوێریخ) دەبێت بە گوتاربێژ، بەتایبەتی لە ساڵی (١٥١٩ز) دا کاتێك بەگژ (بردناردن سامسۆن – BrenardianSamson)دا چووەوە کە نوێنەری پاپا بوو لە ناوچەکانی سویسرا بۆ فرۆشتنی پسولەی لێبوردن، دواتریش بە توندی ڕەخنەی لە سەروەت و سامانی کڵێسا و دێرەکان و باجی دەیەك گرت[٢٩٠]، بەمەش ئەگەرچی (زوێنگلی) بەر لە (لوتەر) بەساڵێك بۆچوونە دژە کڵێساییەکانی دەرکەوتن و لەڕووی فیکرییەوە لە (لوتەر) بەتواناتر بوو، بەڵام سەرەتای کارەکانی کاریگەری (لوتەر)یان پێوە دیارە.

(زوێنگلی) ساڵی (١٥٢٣ز) کۆی بیروبۆچوونە ریفۆرمخوازییەکانی خۆی لە دووتوێی (٦٧) بەندا خستەڕوو، هەر لەو ساڵەشدا لە ڕێی چەند نامەیەکەوە کە ئاراستەی پاپا و لایەنگرەکانی لە ناوچەکەدا کرد پتر پەرەی بە بۆچوونەکانی دا و ڕوونیکردنەوە، کە تیایاندا پێداگری لەسەر بە تاکە سەرچاوە زانینی ئینجیل دەکات بۆ هەڵهێنجانی ڕەوشت و ژیان و تەنانەت دەسەڵاتی سیاسیش لە جیهانی مەسیحیدا، نەك کڵێسای کاتۆلیکی، سەرجەم دیاردەکانی وەك ڕۆژوگرتن و زیارەتکردنی شوێنە پیرۆزەکان و پەرستنی (سانتەکان – القديس) بە زیاد دەزانێت و ژیانی ڕەبەنی پیاوانی ئایینی و پەرستنی ئایکۆنەکان و زۆرێك لە پەیڕەوەکانی تری کڵێسای کاتۆلیکی ڕەتدەکاتەوە[٢٩١]، لە ساڵی (١٥٢٥ز) یشدا بە تەواوی لە کتێبی (Deveraet Falsa Religion) دا بۆچوونەکانی دەخاتەڕوو[٢٩٢].

بەمجۆرەش لە ساڵی (١٥٢٣ز) ەوە شاری (زوێریخ) دەبێتە ناوەندێکی گرنگی بزاڤی پرۆتێستانتی و تەواوی دیاردە کاتۆلیکییەکان لادەبرێت و دێرەکان دادەخرێن، لەوێشەوە ئەم بزاڤە بەرەو ناوچەکانی تری سویسرا و باشووری ئەڵمانیا پەلدەهاوێت، تەنها ئەو ناوچە

(289) Schevill, Op. Cit., PP. 121; Hayes, Modern Europe…, P. 147.

(290) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 2, PP. 29-30 ; H.G. Koenigsberger and George L. Mosse, Op. Cit., P. 135.

(291) Thomas M. Lindsay, Op. Cit.,Vol. 2, PP. 35-36. ; Hase and Moltby, Op. Cit., P. 263; Hayes and Cole, Op. Cit., P. 32 ; Arthur . P Watts, Op. Cit., PP. 56-57.

(292) "The Cambridge Modern History" , Vol. 2, P. 321.

دواکەوتووانە ناگرێتەوە کە پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان تیایاندا بالآدەستبوون و ئەم بزاڤە زیانی بە بەرژەوەندییە سیاسییەکانی سەرکردەکانیان دەگەیاند، بۆیە ئەو ناوچانە کە لە پێنج (کانتۆن – Canton) پێکدەهات بە کاتۆلیکی مانەوە[٢٩٣]. بەمجۆرەش ناوچەکانی سویسرا بەسەر کاتۆلیك و پرۆتێستانتییەکاندا دابەش دەبێت کە دواتر و لە سالّی (١٥٣١ز) دا دوای ئەوەی (زوینگلی) لە ڕێی زەبر و زەنگەوە هەولّی سەپاندنی بۆچوونەکانی دەدات بەسەر ناوچە کاتۆلیکییەکاندا، جەنگی ناوخۆی لێدەکەوێتەوە کە دواجار هەر لەو شەڕانەدا و لە جەنگی (کاپل – Kappel) دا ڕێککەوتی (١٥٣١/١٠/١١ز) (زوینگلی) ژیانی لە دەست دەدات[٢٩٤].

**تەوەرەی سێیەم: جۆن کالڤن (John Calvin)**

هەرچەندە بە کوژرانی (زوینگلی) بزاڤی پرۆتێستانتی لە سویسرا بۆ ماوەیەك بێ سەرکردە مایەوە، بەلاّم ئەمە مانای کۆتایهاتنی بزووتنەوەکە نەبوو چونکە ئەو ناوچە پرۆتێستانتیانە لە سویسرا بوونە پەناگەی زۆرێك لە ریفۆرمخوازە چالاکەکانی ناوچەکانی تری ئەوروپا، کە بۆ خۆپاراستن لە ستەمی دەسەلاّتەداریەتی ناوچەکانیان ڕوویاندەکردە ئەو ناوچانە، بۆیە هێندەی نەبرد لە نێو ئەم پەناهەندانەدا (جۆن کالڤن) ی پارێزەر و گەورە زانای تیۆلۆجی فەڕەنسایی وەك یەکێك لە دیارترین پێشەنگەکانی بزووتنەوەی پرۆتێستانتی لە شاری (جنێڤ – Geneva) دا دەرکەوت.

(جۆن کالڤن) سالّی (١٥٠٩ز) لە خێزانێکی بەدەرامەتی چینی ناوەڕاست لە هەرێمی (پێکەردی – Picardy) ناوچەی (نۆیۆن – Noyon) لە باکووری ڕۆژئاوای پاریس لەدایکبووە، باوکی پارێزەرێکی لێهاتووی ناوچەکە بوو و دواتریش بووە سکرتێری ئیپسکۆپسی کلّێسای نۆیۆن، بۆیە (کالڤن) هەر زوو تێکەلّ بە ژیانی کلّێسا و خوێندنی ئایینی بوو، دواتریش چۆتە زانکۆی پاریس و درێژەی بە خوێندن داوە، تا لە سالّی (١٥٢٨ز) دا ماستەری

---

(293) Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 383 ; Hayes and Cole, Op. Cit., P. 32.

(294) J. A. R. Marriott, The Evaluation of Modern Europe (1453-1939), 3rd Edition, Methuen and Co. LTD, London, 1948, P. 94; "The New Encyclopedia Britannica", Vol. 15, P. 552 ; H.G. Koenigsberger and George L. Mosse, Op. Cit., P. 139.

له بواری تیۆلۆجیا وەرگرت(٢٩٥). بەڵام هەر لەو ساڵەدا و لەسەر داوای باوکی دەست لە خوێندنی تیۆلۆجیا هەڵدەگرێت و بۆ ماوەی(٣)سێ ساڵ لە زانکۆکانی (ئۆرلانس – Orlans) و (برجیس – Bourges)دا یاسا دەخوێنێت(٢٩٦).

دیارە لەو کاتەدا وەك بەشی هەرە زۆری زانکۆکانی تری ئەوروپا زانکۆی پاریسیش ناوەندی لەئارادابوونی چەندین بیروبۆچوونی فیکری و تیۆلۆجی جیاجیا بووە، کە بێگومان کەم تا زۆر بەسەر رەوتی ژیانی فیکری و ئایینی (کالڤن)ەوە کاریگەر بوون، تا دوواجار بەلای ریفۆرمخوازەکاندا ساغبۆتەوە. هزر و بۆچوونی هیومانیستانەکان هەر زوو سەرنجی (کالڤن)یان راکێشا و کاریگەرییان لەسەر فیکری ئەودانا، لە لایەکی تریشەوە لەو سەروبەندەدا تەقەللا ریفۆرمخوازییەکانی (جاکیوس لیفیڤر - Jacques Lefevery d'Etaples) (1455 – 1536ز) لەئارادابوون و کاریگەرییان بەسەر خوێندکارانی زانکۆی پاریسدا هەبوو(٢٩٧)، جگە لەوەی لەو کاتەدا بیروڕاکانی (لوتەر) دزەیان کردبووە نێو زانکۆی پاریس و هەوادارێکی زۆریان لە نێو خوێندکارەکاندا هەبوو، هەر لەو ساڵانەشدا بوو کە باوکی (کالڤن) لەگەڵ کڵـێسای (نۆیۆن) دا کەوتبووە ناکۆکییەوە کە پێدەچێت تاڕادەیەك کاری کردبێتە سەر (کالڤن) و پتر قینی بەرانبەر کڵـێسا هەڵگرتبێت(٢٩٨)، ئەمانە هەموویان کاریگەر بوون لەو وەرچەرخانەی کە لە تەمەنی (٢٠) بیست ساڵییەوە بەسەر ژیانی فیکری و ئایینی (کالڤن)دا

---

(٢٩٥) ول دیوارانت، قصة الحضارة، الجزء الثالث من المجلد السادس، ص ٢٠٥ -٢٠٦ ؛ Hase and Moltby, Op. Cit., P. 264; Erroll Hulse, John Calvin and his Missionary Enterprise. www.reformedtheology.org/html/issue04/Calvin.

(296) H. G. Koenigsberger and George L. Moss, Op. Cit., P. 142 ; B.G. Armstrong, John Calvin. 1509 – 1564. www.monergism.com/the threshold/articles/quetions/Calvin-biu.

(297) Thomas M. Lindsay , Op. Cit., Vol. 2, P. 95, 141 ; Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 383 ; H.G. Koenigsberger and George L. Mosse, Op. Cit., P. 143 ; B.G. Armstrong , Prevoius Web Page.

(هەر ئەم رووداوەش پتر باوکی (کالڤن)ی هاندا کە داوای لێبکات دەست لە خوێندنی تیۆلۆجی هەڵگرێت.
"The Cambridge Modern History", Vol.2 , P. 352.

هات[٢٩٩] و هێدی هێدی هەڵوێستە ریفۆرمخوازییەکانی روونتر دەبوونەوە کە پێدەچێت هەر ئەمەش وایکردبێت کە دوای مردنی باوکی لەساڵی (١٥٣١ز)دا جارێکی تر (کالڤن) دەست بە خوێندنی تیۆلۆجیا بکاتەوە[٣٠٠].

ساڵی (١٥٣٢ز) (کالڤن) یەکەم بەرهەمی تیۆلۆجی خۆی بە ناونیشانی ( Commentary on Seneca's De Clementing) بلاّوکردەوە و تادەهات تێڕوانینە ریفۆرمخوازییەکانی ئاشکراتر دەبوون و وەك یەکێك لە سەرکردە ریفۆرمخوازەکان لە زانکۆی پاریسدا دەردەکەوت[٣٠١]، تایبەت دوای ئەوەی کە (نیـــکۆلاس کاپ – NicholasCap) لە مەراسیمی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی زانکۆدا ئەو گوتارەی خوێندەوە کە تیایدا رەخنەی لە فەلسەفەی سکۆلاستی گرت و داواکاری ریفۆرم بوو، کە دواتر (کالڤن)یش بەوە تۆمەتبارکرا کە دەستی لە نووسینەوەی ئەو گوتارەدا بووبێت[٣٠٢]. ئەمانە لە کاتێکدا بوون، کە پاشای ئەو رۆژگارەی فەرەنسا (فرانسیسی یەکەم–1547 – 1515) (Francis I ز) زۆر بە توندی کەوتبووە وێزەی ریفۆرمخوازان و راوەدوونانیان، بۆیە (کالڤن) ناچاربوو لە ساڵی (١٥٣٤ز) بە دواوە وڵات جێبهێڵێت و لە ناوچەکانی باشووری فەرەنسا و ئیتالیا و سویسرا پەناهەندە ببێت[٣٠٣]، هەر لە ساڵی (١٥٣٤ز) یشدا روویکردە شاری بازل لە سویسرا و دوای دوو ساڵیش یەکەم بەرهەمی کتێبە بەناوبانگەکەی (بنەماکانی ئاینی مەسیحی – Institutes of Christian Religion) بلاّوکردەوە، کە تا مردنی (کالڤن) بە پێی گۆڕانکاری و ویستە کۆمەڵایەتییەکان لە فراوانکردن و دەستکاریکردنی بەردەوامیدا بوو، ئەم کتێبەی سەرەتا بە زمانی لاتینی بلاّوکردەوە و دواتریش وەریگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی، کە لە دووتوێیدا

(٢٩٩) نورالدين حاطوم ، تاريخ عصر النهضة...، ص ١٨٠ -١٨١؛ V.H.H. Green , Op. Cit., P. 167; "The Cambridge Modern History" , Vol. 2, P. 352.

(300) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 2, P. 95.

(301) "The Cambridge Modern History" ,Op. Cit., Vol. 2, P. 352.

(٣٠٢) نیکۆلاس کاپ یەکێك بوو لە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆی پاریس لە ساڵی (١٥٣٣ز) کرایە سەرۆکی زانکۆ و هاوڕێیەکی نزیکی (کالڤن) بوو، بەلاّم ئەویش ناچار بوو بەر لە (کالڤن) وڵات جێبهێڵێت. بڕوانە: ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الثالث من المجلد السادس، ص ٢٠٧.

(303) Schevill, Op. Cit., P. 126 ; Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 383 ; Lorine Boettner, Calvinism is History, John Calvin.
www.reformed-theology.org/html/books/calvinism-history/history.htm.

تەواوی بۆچوونە تیۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی بەرجەستەکردووە، بنەما و پرەنسیپە سەرەکییەکانی ئایینزای پرۆتێستانتی و بۆچوونە ریفۆرمخوازییەکانی دارشتووە، کە دواتر بووە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی هەڵهێنجانی خاڵە سەرەکییەکانی بزووتنەوە پرۆتێستانتییەکان، بۆیە (کالڤن) بە (پاپای پرۆتێستانتەکان) ناسراوە(٣٠٤).

ساڵی (١٥٣٦ز) ئەو ساڵەی کە (کالڤن) دەچێتە شاری جنێڤ، خاڵێکی گرنگ لە دەسپێکی دەرکەوتنی (کالڤن) وەك سەرکردەیەك پێکدەهێنێت. شاری جنێڤ کە لە ساڵی (١٥٣٥ز) دا و لە ژێر کاریگەری (ولیەم فاریل – 1565 – 1489) (William Farel ز) دا کە ریفۆرمخوازێکی شارەکەبوو، لەو کاتەدا پرۆتێستانتی بوونی خۆی راگەیاندبوو، پێویستی بە کەسێکی وەك (کالڤن) بوو بۆ سەرۆکایەتیکردنی کڵێسای شارەکە، بۆیە دوای سووربوونێکی زۆری (فاریل)، (کالڤن) بەمە رازیبوو و دووقۆڵی دەستیان بە پیادەکردنی بۆچوونە ریفۆرمخوازییە توندڕەوییەکانیان کرد، کە بووە مایەی نیگەرانی دانیشتووانی شارەکە، بۆیە ساڵی (١٥٣٨ز) لە شار دەرکران(٣٠٥)، (کالڤن) چــــووە شاری (ســــــــــتراسبۆرگ – Strassburg) و بۆ ماوەی (٣) سێ ساڵ وەك گوتاربێژ و مامۆستای تیۆلۆجیا لەوێ مایەوە و هەر لەو ماوەیەشدا پەیوەندی بە ریفۆرمیستە ئەڵمانییەکانەوە کرد و پتر ئاشنای بیروڕاکانی (لوتەر) بوو(٣٠٦).

ساڵی (١٥٤١ز) جارێکی تر (کالڤن) گەڕایەوە جنێڤ و ئەمجارەیان تا مردنی لە ساڵی (١٥٦٤ز) دا بوو بە سەرۆکی ئایینی و سیاسیی شار، لێرەوە جنێڤ بووە یەکێك لە ناوەندە هەر گرنگەکانی بزاڤی پرۆتێستانتی لەسەر ئاستی ئەورووپا و پێشکەوتنێکی گەورەی

---

(304) Hayes, Modern Europe…, P. 149 ; Ferguson and Bruun, Op. Cit., P. 383 ; James Harvey Robinson and Others, Op. Cit., P. 321; "The New Encyclopedia Britannica", Vol. 15, P. 552.

(305) Hase and Maltby, Op. Cit., PP. 264-265 ; "Encyclopedia International" , Vol. 15, P. 340 ; B.G. Armstrong, Previous Web Page.

(٣٠٦) هەر لەو ماوەیەشدا (کالڤن) پەیوەندی نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ (میلانگتن) دا پەیداکرد کە تا دوای مردنی (کالڤن) ئەمە ئاشکرا نەبوو. "The Cambridge Modern History", Vol. 2 , P. 363 .

بەخۆیەوەبینی، هەر لە ماوەی ئەو (٢٣) بیست و سێ ساڵەشدا (کالڤن) توانی تەواوی بیروبۆچوونەکانی خۆی بەرجەستە بکات(٣٠٧).

ئەگەرچی (کالڤن) سەرەتا بەکارەکانی (لوتەر) کاریگەر بوو، بەڵام دواتر کارەکانی زۆر رادیکالانەتر دەرکەوتن بەجۆرێك تەواوی ئەو پەیڕەوانەی رەتکردەوە کە لە خودی کتێبی پیرۆزەوە سەرچاوەیان نەگرتبوو، پێداگرییەکی زۆری لەسەر (قەدەر) دەکرد بەو پێیەی کە چارەنووسی مرۆڤ لە رۆژی لەدایکبوونییەوە دیاریکراوە و رەفتاری رۆژانە رۆڵیان نییە، (کالڤن) تەنانەت پێکهاتەی کڵێسای بەوجۆرەی لای کاتۆلیکییەکان باوبوو رەتکردەوە و بەڕێوەبردنی کڵێسای خستە دەستی ئەنجوومەنێکی دەوری هەڵبژێردراو بەناوی (سێندۆز-Syndos) بەهاوکاری ئەنجوومەنی پیران (Presbyterian)(٣٠٨).

ئەمە جگە لەوەی کە (کالڤن) بزووتنەوەکەی وەك بزووتنەوەیەکی نێونەتەوەیی دەناساند، کە هەوڵیدا لە رێی میسیۆنێرەکانەوە بیروڕاکانی بڵاوبکاتەوە، میسیۆنێرەکانی بەزۆربەی ناوچەکاندا بڵاوبوونەوە بەتایبەتی لە فەرەنسا و زەوییەنزمەکان و هەنگاریا و بۆهیمیا و پۆڵەندا، بۆ نموونە هەر لە ساڵەکانی (١٥٥٥ تا ١٥٦٢ز) نزیکەی (٨٨) میسیۆنێری کالڤنی لە جنێڤەوە رەوانەی فەرەنسا کران، جگە لەوەی خەڵکێکی زۆر لە ناوچە جیاجیاکانی ئەوروپاوە روویاندەکردە جنێڤ بۆ خوێندنی یاسا و پرەنسیپە پرۆتێستانتییەکان کە دواتر دەبوون بە هەوێنی بڵاوبوونەوەی پرۆتێستانتی و کالڤنیزم لە ناوچەکانی خۆیان، بۆیە کالڤینزم بووە بزووتنەوەیەکی نێونەتەوەیی و بەزۆربەی ناوچەکانی ئەوروپا و تەنانەت ئەمریکاشدا بڵاوبووەوە(٣٠٩).

---

(٣٠٧) هـ. أ. فشر، أصول التأريخ الاوربي، ص١٥٣، لە ئینگلیزییەکەدا H. A. L. Fisher, Op. Cit., P. 544 ; Hase and Maltby, Op. Cit., P. 265.

(308) Hayes and Cole, Op. Cit., PP. 34-35 ; Claue Beaufort Moss, Op. Cit., P. 229.

(309) Hayes, Modern Europe…, Op. Cit., P. 150 ; Erroll Hulse, Previous Web Page.

## باسی سێیەم:

## بڵاوبوونەوەی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بە ناوچەکانی تری ئەوروپادا

لە سەدەی شازدەدا ئەو تەوژمی نارەزاییەی، کە بەشی هەرە زۆری ناوچەکانی جیهانی کاتۆلیکی گرتبووەوە کۆمەڵی تەواو تامەزرۆی بزووتنەوەیەك کردبوو، کە بتوانێت ببێتە ئاراستەکەری ئەم تورەییە کۆمەڵایەتییە کە گوتارە ئایینییەکان لەو رۆژگارەدا کاراترین رەوتی لەئەستۆگرتنی ئەم ئەرکەبوون، بۆیە بیرورا ریفۆرمخوازییەکان زۆر بە خێرایی بە ناوچەکانی تردا تەشەنەیانکرد و بەپێی هەلومەرج و تایبەتمەندی ناوچە جیاجیاکان مۆرك و ئاراستەی وەرگرت و هێدی هێدی لە بەرگی راستەقینەی خۆیدا وەك بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی – سیاسیی ئەرکە مێژووییەکەی جێبەجێکرد.

### تەوەرەی یەکەم: بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لە ناوچەکانی ئەسکەندەناڤیا

دەوڵەتانی ئەسکەندەناڤیا (سوید و نەرویج و دانیمارك) لە ساڵی (١٣٧٩ز) بەدواوە لە سایەی یەکێتی کالمەر (Kalmar)دا یەکیانگرتبوو. بەڵام لە سەرەتای سەدەی شازدەوە هەر یەك لەمانە کەوتنە هەوڵی جیابوونەوە و پێکەوەنانی دەوڵەتی ناوەندی سەربەخۆ، بۆیە لەو میانەدا بیروراکانی (لوتەر)یان بە باشترین پشتگیری ئەو هەنگاوە و خۆبەهێزکردنیان دەزانی، لە رێی دەستبەسەرداگرتنی سەروەت و سامانی کڵێسا و ملکەچکردنی پیاوانی ئایینی و خۆماڵیکردنی کڵێساوە[٣١٠]، هەر بۆیە ئەم بزووتنەوەیە لەم ناوچانەدا بە پشتگیری پاشاکان دەرکەوت.

لە دانیمارك بەر لە دەرکەوتنی بزووتنەوەکەی (لوتەر) بەچەند ساڵێك یەکێك لە پاشا هەرە بە پەرۆشەکانی پێکەوەنانی دەوڵەتی سەربەخۆ بە ناوی (کریستیانی دووەم – Christian 2) (1513 – 1523)ز) دەرکەوت، هەنگاوەکانی لەوکاتەدا گەیشتنە لوتکە کە (لوتەر) نامەکەی

(310) Schevill, Op. Cit., P. 116.

ئاراستەی میرەکانی ئەڵمانیا کرد، بۆیە ئەم پاشایە پشتگیرییەکی گەورەی لەو بۆچوونانەی (لوتەر)دا دەبینییەوە بۆ هەنگاوەکانی، هەر بۆیە کەوتە پشتگیریکردنی ریفۆرمخوازان[311]، بەلاّم مردنی (کریستیانی دووەم) رێی پێنەدا هەنگاوەکانی بگەیەنێتە سەر، دوای ئەمیش پاشا(فریدریکی یەکەم - Fredrick 1) هات و هەمان هەنگاوەکانی ئەوی گرتەبەر لە پشتگیریکردنی ریفۆرمخوازان و بلاّوبوونەوەی لوتەریزم، لە ئەنجوومەنی (ئۆدینس – Odenees) یشدا ساڵی (١٥٢٧ز) کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگی لەم بارەیەوە هەڵێنا، بەلاّم گیروگرفتە ناوخۆییەکان بواریان پێنەدا لەم هەنگاوەدا بەردەوام بێت[312]، تا دواجار (کریستیانی سێیەم – Christina 3) (1534 – 1559ز) هاتە سەر تەخت کە زۆر بەدەربەست بوو بۆ سەپاندنی لوتەریزم و هەر زوو پەیوەندی بە کۆمەڵەی (شمالکالدك) کرد و لە ساڵی (١٥٣٦ز)یشدا بە فەرمی لوتەریزمی کردە ئایینزای وڵات و دەستی بەسەر سەروەت و سامانی کڵێسادا گرت[313].

لە سویدیش بەهەمانشێوە دوای ئەوەی (گۆستافۆس ڤازا – Gustavus Vasa) (1523 – 1560ز) توانی سەربەخۆیی بۆ وڵات دەستەبەربکات، لە پێناو پێکەوەنانی دسەلاّتێکی تۆکمە و دەوڵەتێکی ناوەندی لە رێی دەستبەسەرداگرتنی سامانی کڵێسا و ملکەچکردنی خانەدان و پیاوانی ئایینییەوە، کەوتە پشتگیریکردنی ریفۆرمخوازەکان و لە ئەنجوومەنی یەکەمی (فیستیراس – Westeras) دا لە ساڵی (١٥٢٧ز) دا زۆرێك لە بیروڕاکانی (لوتەر)ی سەپاند و دەستی بەسەر سەروەت و سامانی کڵێسادا گرت. دواتریش لە ساڵی (١٥٥٤ز) دا و لە ئەنجوومەنی دووەمی فیستیراسدا بە فەرمی لوتەریزمی وەك ئایینزای وڵات سەپاند[314] بەجۆرەش لە ساڵی (١٥٥٤ز) بەدواوە لوتەریزم بووە ئایینی فەرمی ناوچەکانی ئەسکەندەناڤیا[315].

---

(311) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 54.

(٣١٢) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد السادس، ص ٢٣٥

Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 54.

(313) J.A. R. Marriott, Op. Cit., P. 93 ; Arthur . P. Watts, Op. Cit., P. 55.

(314) Edward Raymond Turner , Op. Cit., P. 181 ; J.A. Marriott, Op. Cit., P. 92.

(٣١٥) دەربارەی بلاّوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

**تەوەرەی دووەم: بلاّوبوونەوەی ریفۆرم لە ناوچەکانی رۆژهەلاّتی ئەوروپا**

نارەزایی لە کلّێسای کاتۆلیکی ناوچەکانی رۆژهەلاّتی ئەوروپاشی گرتبووەوە بۆیە بیرورِا ریفۆرمخوازییەکان خێرا بە نێو زۆرێك لە شارنشین و چینی بۆرجوازی و جووتیاران و رۆشنبیرانی ئەو مەلّبەندانەدا بلاّوبووەوە، بەلاّم لەو ناوچانەدا کە دەولّەتەکان تەواو سەربەخۆبوون و بەهۆی دوورییانەوە لە ناوەندی پاپایی، کەمتر کلّێسای رۆما دەستیان لە کاروباری کلّێساکانیان وەردەدا، بۆیە پاشاکان هیچ بەرژەوەندییەکیان لە پشتگیریکردنی ئەم بزووتنەوەیەدا نەبوو، بەلّکو بە هەرِەشەیەکی گەورەیان دەزانی لەسەر یەکێتی ولاّت و دەسەلاّتی خۆیان، بۆیە بە توندی کەوتنە هەولّی بەرگرتن بە بلاّوبوونەوەی ئەم بزووتنەوەیە.

لە هەنگاریا دوای ئاشنابوونی خەلّکی ناوچەکە بەم بیروبۆچوونانە لە رێی ئەو خوێندکارانەوە کە لە زانکۆی ئێرفۆرتەوە دەگەرِانەوە، ئەم بیرورِایانە زۆر بە خێرایی بلاّوبوونەوە و بزووتنەوەیەکی گەورەی لێکەوتەوە کە سەرەرِای هەموو ئەو زەبر و زەنگەی پاشاکان بۆ بنەبرِکردنیان بەکاریان دەهێنا، فراوانتر دەبوون، بە جۆرێك لە سالّی (١٥٥٠ز) بەدواوە بەشی هەرە زۆری هەنگاریا پرۆتێستانتی بوون[٣١٦]، کە کالڤنییەکان زۆرینەیان پێکدەهێنان[٣١٧].

لە پۆلّەندا[٣١٨] لە پالّ کاریگەری خوێندکارە گەرِاوەکانی زانکۆی ئێرفۆرتەوە، هەر یەك لە دەرکەوتنی چەند ئیپسکۆپسێکی رادیکال لە پۆلّەندا و کاریگەری هسییەکانی بۆهیمیا بە هۆی نزیکییەوە، کاریگەربوون لە دەرکەوتن و بلاّوبوونەوەی بزووتنەوەیەکی چالاك کە لەگەلّ هەموو ئەو توندوتیژییەی هەر یەك لە پاشا (سیگمۆندی یەکەم – (Sigismund 1) (1506 – 1548ز) و پاشا (سیگمۆندی دووەم - (Sigismund 2) (1548 – 1572ز) بەرپایانکرد بۆ سەرکوتکردنەوەی ئەم بزووتنەوەیە، بەلاّم تادەهات بە گورتر دەبوو، بەرِادەیەك لە سالّی (١٥٤٠ز) بە دواوە ریفۆرمخوازان بەسەر چەندین شاردا زالّبووبوون[٣١٩].

---

(٣١٦) دەربارەی بلاّوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بروانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(٣١٧) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد السادس، ص ٢٤١؛ "Catholic Encyclopedia", Reformation, Previous Web page.

(٣١٨) دەربارەی بلاّوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بروانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(٣١٩) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد السادس، ص ٢٣٥؛ Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 54.

لە بۆهیمیاش بەهۆی کاریگەری هسییەکانەوە ئەم بیروڕایانە شتێکی نوێ و نامۆ نەبوون، بۆیە بیروڕا پرۆتێستانتییەکان بە خێرایی لەوێ بلاّودەبوونەوە[٣٢٠]، سالّی (١٥٦٠ز) بەدواوە زۆرینەی خەلّکی بۆهیمیا ببوونە پرۆتێستانتی[٣٢١].

لە ئیتالیا و ئیسپانیا و پورتوگالیش سەرەڕای ئامادەیی ئەم ناوچانە بۆ ئەم بزووتنەوەیە کە وەك (ڕۆدریگۆ نائینۆ – Rodrigo Nino) کە لەو ڕۆژگارەدا نوێنەری ئیمپراتۆر بوو لە ئیتالیا و لە سالّی (١٥٣٥ز) دا دەنووسێت: "کەم کەس هەیە لە ڤینسیا ئەگەر لە خودی (لوتەر) لۆتەریتر نەبێت"[٣٢٢]. وێرای بلاّوبوونەوەی بیروڕای ریفۆرمیستەکان لەو ناوچانەدا، بەلاّم بەهۆی بەهێزی دەسەلاّتی هەر یەك لە پاپا و ئیمپراتۆر لەو ناوچانەدا، هەولّە ریفۆرمخوازییەکان لە چوارچێوەی هەولّی کەسەکاندا قەتیس مانەوە و نەبوونە بزاڤێکی کۆمەلاّیەتی بەرفراوان[٣٢٣].

کەچی هۆلّەندا[٣٢٤] لەگەلّ ئەوەشدا کە لەو ڕۆژگارەدا بەشێکی سەر بە شانشینی ئیسپانیا بوو و لەژێر توندوتیژترین زەبر و زەنگیشدا بوو کە هەر یەك لە (چارلسی پێنجەم) و (فیلیپی دووەم) (١٥٥٦ – ١٥٩٨ز) بۆ بنەبڕکردنی ئەو بزووتنەوەیە پیادەیان دەکرد، بەلاّم بۆچوونەکانی (کالڤن) زۆر بە خێرایی لە سویسراوە خزینە هۆلّەنداوە و لە شێوەی بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخواز لە دەسەلاّتی بێگانە خۆینواند و لە سالّی (١٥٨١ز) بەدواوە هەرێمە هۆلّەندییەکان توانییان کۆمارێکی هۆلّەندی کالڤنی دابمەزرێنن[٣٢٥].

---

(٣٢٠) دەربارەی بلاّوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(٣٢١) ول دیورانت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد السادس، ص ٢٤٠ .

(322) "The Cambridge Modern History", Vol. 2 , P. 378.

(323) Schevill, Op. Cit., P. 116 ; "Catholic Encyclopedia", Reformation, Previous Web Page.

(٣٢٤) دەربارەی بلاّوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(٣٢٥) سعد رستم ، المصدر السابق، ص ١٥٣-١٥٤؛ سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦-١٢٧
Loraine Botter, Calvinism Holland, Previous Web Page.

## تەوەرەی سێیەم: بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لە سکۆتلاند

لە سکۆتلاند[٣٢٦] ئەم بزووتنەوەیە زیاتر وەك بزووتنەوەیەکی میللی رووبەڕووی پاشاکان بووەوە دژی دەستێوەردانە دەرەکییەکان، بەتایبەتی دژی فەرەنسا[٣٢٧]. لەوێدا ئەم بزووتنەوەیە لەسەر دەستی کەسایەتی (جۆن نۆکس – John Knox) (1506 – 1574ز) دا بڵاوبووەوە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەوە هەڵوێستە دژە کڵێسایەکانی دەرکەوتن، دواتریش دوای ئەوەی ماوەیەك لە فەرەنسا بەندکرا هێندەی تر بەقین بوو بەرانبەر فەرەنسا و کڵێسای کاتۆلیکی[٣٢٨]، بۆیە تادەهات هەڵوێستەکانی توندوتیژتر دەبوون ، تایبەت دوای ئەوەی ماوەیەکی ژیانی لە جنێڤ بەسەربرد لە نێوان ساڵەکانی (١٥٥٤-١٥٥٩ز) و بە توندی کەوتە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی (کالڤن)ەوە، بۆیە دوای گەڕانەوەی بۆ سکۆتلاند لە ساڵی (١٥٥٩ز)دا رەوشی پڕ لە نارەزایی لە کڵێسای کاتۆلیکی و شاژنە (ماری ستیوارت)[٣٢٩]ی قۆستەوە و دەستی بە چالاکییە ریفۆرمخوازییەکانی کرد و لە نزیکەی یەك ساڵدا ئەم بزووتنەوەیە تەواوی سکۆتلاندی گرتەوە و لە ساڵی (١٥٦٠ز) بە دواوە کالڤنیزم بووە ئاینی سەرەکی و فەرمی لە سکۆتلاند[٣٣٠].

---

(٣٢٦) دەربارەی بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(٣٢٧) هەر چەندە سکۆتلاند لەو رۆژگارەدا وڵاتێکی سەربەخۆ بوو، بەڵام زۆر لاواز بوو، بەدەست دەستێوەردانی هەر یەك لە ئینگلستان و فەرەنساوە دەیناڵاند، هەر یەك لەم دوو وڵاتەش هەوڵیاندەدا لە رێی ژنخوازییەوە پێگەی خۆیان لە سکۆتلاند بەهێز بکەن، بۆ نموونە (ماری ستیوارت(Mary Stuart – ی کچی پاشا (جیمسی پێنجەم (James V - ی سکۆتلاند، نەوەی مارگرێتی خوشکی هێنری هەشتەمی ئینگلستان بوو، دواتریش بوو بە ژنی فەرانسیسی یەکەمی پاشای فەرەنسا. بڕوانە:

H.G. Koenigsberger and George L. Moss, Op. Cit., P. 280.

(٣٢٨) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الرابع من المجلد السادس، ص ٢٠٢-٢٠٣.

(٣٢٩) شاژنە ماری ستیوارت لەوکاتەدا ژنی (فرانسیسی دووەمی) پاشای فەرەنسا بوو لە فەرەنسا دەژیا، سکۆتلاندیش لە لایەن دایکییەوە، بە یارمەتی سوپای فەرەنسا بەڕێوە دەچوو، بۆیە دوای گەڕانەوەی بۆ سکۆتلاند نەیتوانی بەسەر قەیرانەکەدا زاڵبێت. محمد محمد صالح، المصدر السابق، ص ٢٦٥.

(330) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 59 ; H.G. Koenigsberger and George L. Mosse, Op. Cit., PP. 280-281.

## تەوەرەی چوارەم: ریفۆرمی ئایینی لە ئینگلستان

لە ئینگلستان[٣٣١] ئەم بزووتنەوەیە بە ئاراستەیەکی تەواو جیاواز لە ناوچەکانی تری ئەوروپا دەرکەوت کە کۆمەڵێك فاکتەر و تایبەتمەندی وایانکرد لەوێدا پاشا بۆ خۆی بەگژ دەسەڵاتی کڵێسا و پاپادا بچێتەوە و ئەرکی بەرپاکردن و ئاراستەکردنی ئەم بزووتنەوەیە بگرێتە ئەستۆ.

ئینگلستان لەمێژبوو وەك دەوڵەتێکی ناوەندی دەرکەوتبوو و لە هەڵپەی خۆ بەهێزکردن و رکابەرایەتیکردنی ناوچەکانی تردا بوو، بۆیە هەستی رێگرتن لە دەستێوەردانە دەرەکییەکان و قوتاربوون لەو باجانەی کە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی بێگانە دەکەن هەر زوو لەوێدا چەکەرەیانکرد و لەگەڵ رەوتی رووداوەکاندا گەشەیاندەکرد[٣٣٢]، تا سەرەنجام لە سەدەی شازدەدا بە خەملینی چینی بۆرجوازی و بەرژەوەندییەکانی و پێویستی پتری وڵات بە دەسەلاتێکی ناوەندی بەهێز و رۆچوونی بیرۆکەی قوتاربوون لە باجە دەرەکییەکان و دەستێوەردانی بێگانە بە نیو بەشی هەرە زۆری کـــۆمەڵـــگادا[٣٣٣]، وایانکرد ئینگلستان لەو کاتەدا وەك دەوڵەتێکی ناوەندی و پاشایەتی رەها لە ئاستێکدا بوو کە تەنها پێویستی بە خۆماڵیکردنی کڵێسا و جیابوونەوە لە رۆما بوو. هەر لەم سەروبەندەشدا هەواڵی بزووتنەوەکەی (لوتەر) دەنگیدایەوە و بیروراکانی دزەیانکردبووە ئینگلستانەوە[٣٣٤]، هەموو ئەمانە زەمینەسازی دەرکەوتنی هەوڵە جیاخوازییەکانی (هێنری هەشتەم - Henry 8) (1509-1547ز) بوون کە لە دەیەی سێیەمی سەدەی شازدەدا بە تەواوی تەقییەوە.

(هێنری هەشتەم) ئەگەرچی لەو رۆژگارەدا یەکێك بوو لە پاشا کاتۆلیکییە دڵسۆزەکان و بە توندی دژایەتی ئەو کەسانەی دەکرد، کە دژی کڵێسا بوونایە و تەنانەت لە ساڵی (١٥٢١ز)یشدا وەڵامدانەوەیەکی توندی ئاراستەی کارەکانی (لوتەر) کرد، پاپا نازناوی

---

(٣٣١) دەربارەی بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بروانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(٣٣٢) هەر وەك لە بەشی یەکەمیشدا باسکراوە کۆتایی سەدەی چواردە هەر هەمان ئەو فاکتەرانە بوون کە دوای گواستنەوەی مەڵبەندی پاپایی بۆ فەرەنسا وایان لە دەسەڵاتداریەتی ئەو کاتەی ئینگلستان کرد پشتگیری لە کارەکانی جۆن وێکلف بکەن.

(333) Leopold Van Ranke, A History of England. Principally in the Seventeenth century, Vol. 1, AMS press, INC, New York, 1966, PP. 134-137.

(334) G. M. Trevelyan , History of England , Longman , Green and Co, London-New York- Toronto, 1958, PP. 299-300

بەرگریکەری باوەڕ (Defender of Faith)ی پێبەخشیبوو[٣٣٥]، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەستی بە گرنگی جیابوونەوەی کڵێسای ئینگلستان لە کڵێسای رۆما کرد بۆ بەهێزکردنی دەسەلات و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئینگلستان، بۆیە هەوڵیدا ئەو کێشەیەی نێوان خۆی و پاپا (کلمنتی حەوتەم - Clement 7) وەك هەلێك بۆ ئەم مەبەستە بقۆزێتەوە، ئەو کێشەیەی کە لە دەیەی دووەمی سەدەی شازدەوە لە ئەنجامی داواکاری (هێنری هەشتەم) بۆ جیابوونەوە لە (کاترین ئەراگۆن - Cathrine Araggon) و مارەکردنی (ئان بۆلین – Anne Boleyn) سەریهەڵدا[٣٣٦] و تادەهات پتر لە بەرگی قەیرانێکی سیاسیدا دەردەکەوت و (هێنری) قەبارەیەکی گەورەتری پێدەدا و تەنانەت (تۆماس وێلز – Thomas Wolse) ی راوێژکاری خۆی بۆ یەکلاکردنەوەی تەرخانکرد، بەلام پاپا جگە لەوەی کە ئەم کردارە بە پێی پرەنسیپەکانی کاتۆلیکی رێی پێنەدرا بوو، لە هەمانکاتدا لە تورەبوونی ئیمپراتۆر (چارلسی پێنجەم) دەسلەمییەوە کە خوشکەزای (کاترین ئەراگۆن) بوو، بۆیە ئەم داواکارییەی جێبەجێنەکرد[٣٣٧]، بەمەش بارەکە تادەهات گرژتر دەبوو تا دواجار ساڵی (١٥٣٤ز) لە رێی بڕیاری پەرلەمانەوە (هێنری هەشتەم) جیابوونەوەی کڵێسای ئینگلستانی لە کڵێسای رۆما راگەیاند و هەر بە پێی بڕیاری پەرلەمان پاشا بووە سەرۆکی کڵێسای ئینگلستان و (تۆماس کرانمەر - Thomas Cranmer) کرا بە سەرۆك ئیپسکۆپسی کانتێربۆری (Canterbury) و

---

(335) Anthony Toyne, An English – Reader's History of England, Oxford University Press, 1971. P. 105.

ج.م. روبرتس ، موجز تاريخ العالم، ترجمة فارس قطان، الجزء الثاني، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٤، ص ٥٧٩.

(٣٣٦) (کاترین) براژنی گەورەی (هێنری) بوو، دوای مردنی مێردەکەی (هێنری) مارەی کردەوە، دوای ئەوەی شەش منداڵیان بوو تەنها کچێکیان بۆ مابووەوە، بەلام (هێنری) دەیویست کوڕێکی هەبێت بۆ ئەوەی شوێنی بگرێتەوە، بۆیە بیری لە خواستنی ئان بۆلینی ئینگلیزی کردەوە. بڕوانە:

James Harvey Robinson and Others, Op. Cit., PP. 322-323.

(٣٣٧) راس ئی. دان و دیگرش، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠ ؛ ج. م. روبرتس، المصدر السابق، ص ٥٧٩.

Anthony Toyn, Op. Cit., P. 105.

بەفەرمی مارەکردنی (ئان بۆلین) دانیپێدانرا، بەمەش (هێنری هەشتەم) هەردوو مەرامە سیاسیی و کەسییەکەی بەدیهێنا[٣٣٨].

ئەم رووداوە ئەگەرچی لەڕووی سیاسییەوە پێشکەوتنێکی گەورەبوو بۆ ئینگلستان، بەلاّم لە هەمانکاتدا کێشەیەکی کۆمەلاّیەتی درێژخایەنی لێکەوتەوە، کە بووە مایەی هەلّوەشاندنەوەی شیرازەی ئایینی لە ئینگلستان و دواجار لەگەلّ رەوتی رووداوەکانیدا فۆرمی کۆتایی پێکهاتەی ئایینی لە ئینگلستان و بنەماکانی باوەڕی ئینگلیکانی بەرجەستە بوون، چونکە ئەم رووداوە سەرەتا جگە لە جیابوونەوەیەکی سیاسیی هیچی تر نەبوو، (هێنری) ئەگەرچی بە توندی کەوتە سەرکوتکردنی ئەو کاتۆلیکییانەی بەم جیابوونەوەیە ناڕازیبوون، هێرشێکی فراوانی کردە سەر دێرەکان و بە لایەنگرانی پاپا لەقەلّەمیدان و دەستی بەسەر سەروەت و سامانەکانیاندا گرت و بە توندی ئەو راپەڕینەی دامرکاندەوە، کە کاتۆلیکییەکان بە ناوی (حاجییە موجاهیدەکان – The Pilgrime of Grace)ەوە بەرپایانکرد، لە هەمانکاتدا سەرسەختانە کەوتە بەرگریکردن لە مانەوەی پرەنسیپە کۆنەکان و دژایەتیکردنی ریفۆرمخوازان و سەرکوتکردنیان[٣٣٩].

هەرچەندە پێویستی (هێنری هەشتەم) بە پشتگیری پرۆتێستانتییەکانی ئەلّمانیا و زۆربوونی بەردەوامی پرۆتێستانتییەکان، (هێنری)یان ناچارکرد سالّی (١٥٣٦ز) و بە پێی ئەو (١٠) بەندەی کە خستنیە بەردەم پەرلەمان تارادەیەك پرەنسیپە پرۆتێستانتییەکان رەچاو بکات[٣٤٠]، بەلاّم هێندەی نەبرد سالّی (١٥٣٩ز) جارێکی تر لەو (٦) بەندەدا کە خستنیە بەردەم پەرلەمان لەم هەلّوێستە پاشگەز بووەوە و پرەنسیپە پرۆتێستانتییەکانی پشتگوێ خستەوە[٣٤١].

---

(٣٣٨) علی حیدر سلیمان، المصدر السابق، ص٩٩؛ Leopold Von Ranke, Op. Cit., PP. 148-149; James Harvey Robinson and Others, Op. Cit., P. 323.

(339) Anthony Toyn, Op. Cit., P. 107 ; G.M. Trevelyan , Op. Cit., PP. 307-309.

(340) "Encyclopedia International", Vol. 15, P. 41 ; Leopold Von Ranke, Op. Cit., P. 157.

(٣٤١) هـ. أ. فشر ، أصول التأريخ الاوروبي الحديث...، ص١٢٤، لە ئینگلیزییەکەیدا:
H. A. Fesher , Op. Cit., P. 519 ; Leopold van Ranke , Op. Cit., PP. 162-163.

ئەم کێشەیە دوای مردنی (هێنری هەشتەم) هێندەی تر ئالۆز بوو، پاشاکان بە ئاشکرا هەڵوێستە ئایینییەکانیان رادەگەیاند و لە ناکۆکییەکاندا دەبوون بە لایەن و راستەوخۆ دەستیان لە پرۆسەی کامڵبوونی باوەڕی ئینگلیکانیدا دەبوو.

لە سەردەمی (ئێدواردی شەشەم- Edward 6) (1547 – 1553ز) دا پرۆتێستانتەکان بالادەستبوون و خێرا شەش بەندەکەی (هێنری هەشتەم) رەتکرانەوە و ژمارەی پرۆتێستانتەکان زیادیکرد و چەندین پلە و پایەی بالاّیان لە کلێسا و پەرلەماندا بەدەستهێنا، بیروبۆچوونە پرۆتێستانتییەکان لە ناوچەکانی سویسرا و ستراسبۆرگەوە خزینە ئینگلستانەوە[342]، گوتاربێژە پرۆتێستانتەکان کە لە سەردەمی (هێنری هەشتەم)دا گوتاربێژییان لێ قەدەغەکرابوو، دەستیان بە گوتارەکانیان کردەوە، هەر لەو رۆژگارەشدا کتێبە بەناوبانگەکەی (تۆماس کرانمر) بە ناوی (کۆمۆن پرایەر The Common Prayer Book) بلاّوبووەوە کە سەرەتا بە زمانی لاتینی بوو، بەلاّم دواتر بە زمانی ئینگلیزی و بە جەختکردنەوەیەکی پتری پرەنسیپە پرۆتێستانتییەکانەوە لە چاپدرایەوە، لە سالّی (١٥٥١ز) یشدا کرانمر (٤٢) بەندەکەی وەك دیاریکردن و راگەیاندنی باوەڕی ئینگلیکانی بلاّوکردەوە[343].

بەلاّم لە سەردەمی (شاژنە ماری- Queen Mary) (1553 – 1558ز) دا کە کچی (هێنری هەشتەم) بوو، بەلاّم لە (کاترین ئەراگۆن) و کاتۆلیکی بوو، جارێکی تر باوەڕی کاتۆلیکی سەپاندەوە و کلێسای ئینگلستانی خستەوە ژێر رکێفی رۆما و کەوتە راوەدوونانی پرۆتێستانتییەکان[344]، تایبەت دوای ئەوەی مێردی بە (فیلیپی دووەمی- Philip 2) (1556 – 1564ز) کوڕی ئیمپراتۆر (چارلسی پێنجەم) کرد، بەجۆرێك کە لە ماوەی ئەو(٤)چوار ساڵەی حوکمڕانیدا نزیکەی(٣٠٠) پرۆتێستانتی لە ئاگردا سوتێندران[345].

---

(342) G.K. A. Bell, The English Church , London, P. 21 ; Smith and Others, Op. Cit., P. 259 ; "Encyclopedia International' , Vol. 15, P. 41.

(343) C. M. Trevelyan , Op. Cit., P. 313 ; "Encyclopedia International", Vol. 15, P. 41.

(344) G.K. A. Bell, Op. Cit., P. 18.

(345) James Harvey Robinson and Others, Op. Cit., P. 325; G.M. Trevelyon , Op. Cit., P.319.

دوای مردنی (ماری) شاژنە (ئەلیزابێس – Queen Elizabeth) کە ئەویش کچی (هێنری هەشتەم) بوو، بەلآم لە (ئان بۆلین) و پرۆتێستانتی بوو، هاتە سەر تەختی پاشایەتی، دوبارە کاتۆلیکییەکان کەوتنە بەر شالآوی ستەمکاری و سەرجەم کارەکانی شاژنە (ماری) رەتکردەوە و لە سالّی (١٥٥٩ز) دا و بە پێی بریاری پەرلەمان جارێکی تر کارەکانی (ئێدواردی شەشەم) خرانەوە کار و دواتریش دوای دەستکاریکردن و پێداچوونەوەی (٤٢) بەندەکەی کرانمەر و دارِشتنەوەیان لە دووتوێی (٣٩) بەنددا بە شێوەیەکی تێکەلّ لە هەر یەك لە پرەنسیپە کاتۆلیکی و پرۆتێستانتەکان[٣٤٦]، بۆ رازیکردنی هەردوولا و لە سالّی (١٥٦٣ز)یشدا بە پێی بریاری پەرلەمان و لە دەستووردا کردی بە ئایینی فەرمی ولآت و بەمەش لەسەردەمی (شاژنە ئەلیزابیس)دا ئایینزای ئینگلیکانی بە تەواوی بەرجەستە بوو[٣٤٧].

### تەوەرەی پێنجەم: بزووتنەوەی ریفۆرم لە فەرەنسا

هەولّە ریفۆرمخوازییەکان وەك پێشتر لە باسی (کالڤن)دا باسمانکرد هەر لە سەرەتای سەدەی شازدەوە لە فەرەنسا دەرکەوتن[٣٤٨]، بیرورای ریفۆرمخوازەکان خێرا ئەو ناوچانەشی گرتەوە، بەلآم فەرەنسا لەو رۆژگارەدا دەولّەتێکی سەربەخۆ بوو و پاشاکانی بەرادەیەکی زۆر دەسەلآتی رەهایان فەراهەمکردبوو، هەروەها بە پێی رێککەوتننامەی (بۆلۆنیا – Bolonga) لە سالّی (١٥١٦ز) کە لە نێوان (فرانسیسی یەکەم – 1547 – 1515) (Francis 1ز) و پاپا (لیۆی دەیەم) دا بەسترا مافی دەستنیشانکردنی پیاوانی ئایینی فەرەنسایان دەستەبەرکردبوو[٣٤٩]، بۆیە بەرژەوەندییەکی ئەوتۆیان لەم بزووتنەوەیەدا نەدەبینییەوە، بەلّکو بە پێچەوانەوە پتر وەك

---

(346) G.K. A. Bell, Op. Cit., P. 22 ; "Encyclopedia International", Vol. 15, PP. 41-42 ; G. M. Trevelyon , Op. Cit., PP. 328-329.

(٣٤٧) راس نی. دان و دیگرش، سەرچاوەی پێشوو، ل٨١؛ نورالدین حاطوم، تاریخ عصر النهضة...، ص١٩٣
Deborah Hort Sttober and Gerald S. Sttober, The Monarchy. An Oral History of Elizabeth II, Hutchinson, London, 2002, P. 221

(٣٤٨) دەربارەی بلآوبوونەوەی ریفۆرم لەو ناوچانەدا بروانە نەخشەی ژمارە (٣) لە پاشکۆکان ل١٧٢.

(349) Arthur Hassall, Op. Cit., P. 115.

هەرەشەی سەر دەسەلآت و یەکپڕیزی ولآت تەماشایاندەکرد، بۆیە بە توندی کەوتنە هەولّی سەرکوتکردنیان.

بەمجۆرە ئەگەرچی (فرانسیسی یەکەم) دوای ئەوەی لە ململانێی لەگەلّ (چارلسی پێنجەم)دا پێویستی بە پشتگیری پرۆتێستانتەکانی ئەلّمانیا بوو و دوای بەدیلگیرانی لەم شەڕانەدا و لە سالّی (١٥٢٥ز) دا کاتی گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا قینێکی گەورەی بەرانبەر پاپا هەبوو[٣٥٠]، بۆیە سەرەتا تارادەیەك هاوسۆزی بەرانبەر ریفۆرمخوازەکان کە لە فەرەنسا بە (هیگۆنۆت — Huguent) ناسرا بوون، نواند و بەشێوەیەکی بەرچاو بلاّوبوونەوە[٣٥١]، بەلاّم هێندەی نەبرد لە ترسی پەرتەوازەبوونی یەکپڕیزی ولاّت، کەوتە تەگەرە خستنە بەردەم بلاّوبوونەوەی ریفۆرمخوازەکان و لە دەیەی سێیەمەوە زۆر بە توندی دەستیکردە راوەدوونانیان[٣٥٢]، بەلاّم بێئەوەی ئەو زەبر و زەنگە بتوانێت بەر بە بلاّوبوونەوەی هیگۆنۆتەکان بگرێت، بەلّکو تادەهات باوەڕدارەکانی لە نێو شارنشین و بۆرجوازی و جووتیار و رۆشنبیراندا پتر دەبوون، بەرادەیەك کە بەر لە مردنی (فرانسیسی یەکەم) بە دەگمەن ناوچەیەك هەبوو لە فەرەنسا ئەگەر بە نهێنی رێژەیەکی زۆر لە هیگۆنۆتی تێدانەبێت، بەتایبەتی باشوور و رۆژئاوا کە دواتر بوون بە مەلّبەندی ئەم بزووتنەوەیە[٣٥٣].

دوای مردنی (فرانسیسی یەکەم) ئەم کێشەیە هێندەی تر بەرەو ئالۆزی چوو، لە لایەك بەردەوامی پاشاکان لەبەکارهێنانی زەبر و زەنگ، لە لایەکی تریش رۆژ لە دوای رۆژ هیگۆنۆتەکان لە زیادبووندا بوون، تایبەت دوای ئەوەی بیروڕاکانی (کالڤن) خزینە ناوچەکانی فەرەنساوە، کە جگە لەوەی بۆ خۆی بە رەچەلّەك فەرەنسی بوو، بیروڕاکانی بەرادەیەکی زۆر لەگەلّ ویستە کۆمەلآیەتییەکاندا دەهاتەوە، بۆیە کاردانەوەیەکی گەورەی بوو، بەجۆرێك

---

(٣٥٠) (فرانسیسی یەکەم) یەکێك بوو لەو پاشایانەی کە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانی ئاین و ئایینزای رەچاو نەدەکرد، لەم پێناوەشدا تەنانەت دەستی لەگەلّ عوسمانییەکاندا تێکەلّکرد.

(351) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 2, PP. 144-146.

(٣٥٢) عبدالحمید البطریق وعبدالعزیز نوار، التأریخ الاوربي الحدیث (من عصر النهضة الی آواخر القرن الثامن عشر)، دار الفکر العربي، ١٩٨٢، ص١٣١ ؛ Thomas M. Lindsay ,Op. Cit., Vol. 2, PP. 142-145.

(٣٥٣) ارنست بلوخ، فلسفة عصر النهضة، ترجمة وتقدیم وشروح الیاس مرقص، دار الحقیقة، بیروت، د.ت.، ص٣٢؛ V.H.H. Green , Op. Cit., P. 253 .

سەرەڕای ئەو زەبر و زەنگە زۆرەی کە پاشاکان بەرانبەر بە هیگۆنۆتەکان پیادەیان دەکرد، بەڵام لە نێوان ساڵانی (١٥٥٥-١٥٦٢ز) دا پتر لە هەزار گرووپی هیگۆنۆتی لە ناوچە جیاجیاکانی فەرەنسا دەرکەوتن و کڵـێسای خۆیان هەبوو[٣٥٤].

بەجۆرە بە تێپەڕبوونی کات ئەم بزووتنەوەیە لە فەرەنسا مۆرکێکی دژە پاشایەتی وەرگرت، بۆیە لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەوە تەواوی هێزە کۆمەلایەتییە دژەپاشاکانی لە خۆکۆکردەوە، تایبەت ئەو میرانەی کە لە ئەنجامی بەهێزبوونی پاشادا زیانێکی گەورە بەر بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەکانیان کەوتبوو، بە تەواوی خزینە نێو ئەم بزووتنەوەیەوە، بۆ رکابەرایەتیکردنی هەر یەك لە پاشا و میرە ناحەزەکانیان[٣٥٥]، بۆیە لێرەوە ئیدی هیگۆنۆت وەك پارتێکی سیاسیی لە ژێر سایەی بنەماڵەی (بۆربۆن – Baurbon) دا بە رابەرایەتی هەریەك لە (ئەنتوان ناڤاری – Antonio Navarre) و (لویس کۆندیە- Lauis Cond) ی برای دەرکەوت، کاتۆلیکەکانیش لە ژێر سایەی بنەماڵەی (گیز – Guise) و بە پشتیوانی پاشا، باری نێوانیان رۆژ لە دوای رۆژ گرژ و ئاڵۆزتر دەبوو لە پێناو نزیکبوونەوە لە دەسەلات ، تایبەت دوای مردنی (هێنری دووەم) و هاتنە سەر تەختی چەند پاشایەکی منداڵی وەك (فرانسیسی دووەم)(١٥٥٩-١٥٦٠ز)و(چارلسی نۆیەم) (١٥٦٠-١٥٧٤ز) کە لەژێر چاودێری (کاترین میدچی) دایکیاندا فەرمانڕەواییان دەکرد[٣٥٦].

ئەم رەوشی ململانێکردنە تادەهات گرژتر و توندتر دەبوو و بـاری نێـوان ئـەو دوو لایەنـە ئاڵۆزتر دەبوو، تا دواجار ساڵی (١٥٦٢ز) و دوای رووداوەکـەی شـاری (ڤاسـی-Vassy)[٣٥٧] ئاگری جەنگێکی ناوخۆیی درێژخایەنی لێکەوتەوە کە پتر لە سی ساڵی خایاند[٣٥٨].

---

(354) Philip Benedict and Others, Reformation, Revolt and Civil War in France and the Nethelands (1555-1585), Amsterdam, 1999, P. 7, www.knaw.nl/publicaties /pdf/ 981100.pdf. ; A.J. Grant, Op. Cit., P. 299; William Gilbert, France, 1494-1559, Previous Web Page.

(355) "The New Encyclopedia Britannica" , Vol. 15, P. 553 ; A.J. Grant, Op. Cit., P. 299; Philip Benedict and Others, Op. Cit., PP. 8-9.

(٣٥٦) هـ. أ. فشر ، أصول التأريخ الاوروبي الحديث...، ص١٧٨-١٨٨، لە ئینگلیزییەکەیدا :
H.A.L. Fesher, Op. Cit., P. 570 ; Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 2, PP. 172-181.

(٣٥٧) ئەم رووداوە ساڵی (١٥٦٢ز) روویدا کاتێـك کـە (فرانـسیس گیـزی) بـە ناوچـەی ڤاسـیدا تێپـەڕی و هێرشیکردە سەر کۆمەڵێك لە هیگۆنۆتـەکانی ئـەو شـارە کـە لـە کـاتی نوێژکردنـدا بـوون و بەشـێکی زۆری

رووداوەکانی ئەم جەنگە ئەگەرچی بوونە مایەی لەناوچوونی هەزاران کەس لە هیگۆنۆتەکان، تەنانەت تەنها لە قەسابخانەی (سانت. بارتلۆمیو-S. Bartholomew)[٣٥٩]دا سالّی (١٥٧٢ز) پتر لە پێنج هەزاریان لیّ کوژرا، بەلاّم چۆکدانەدانی ئەم هیگۆنۆتانە، رۆژ لە دوای رۆژ دەسەلاّتدارییەتی فەرەنسای ناچاردەکرد هێدی هێدی مافەکانیان لەبەرچاوبگرن، ئەوە بوو هەر لە سالّی (١٥٦٢ز)ەوە بە پێی فەرمانی (سانت. ئەمبرۆز-S. Ambroise) و لە سالّی (١٥٦٨ز)یشدا بە پێی فەرمانی (سانت. جێرمان-S. Germain)، (کاترین میدچی) دەروازەیەکی بچووکی لە ئازادی ئایینی بۆ کردنەوە[٣٦٠]، تا دواجار لە سەردەمی (هێنری ناڤار)ی کە یەکێك لە سەرکردە هیگۆنۆتەکان بوو لە دوای مردنی (هێنری سێیەم) (١٥٨٩-١٦١٠ز) هاتە سەر تەخت، ئەم پاشایە ئەگەرچی وەك هیگۆنۆتێك نەمایەوە، بەلاّم سالّی (١٥٩٨ز) و بە پێی (فەرمانی نانتس-Edict of Nantes) بە فەرمی دانی بە هیگۆنۆتەکاندا نا و ئازادییەکی سیاسیی و ئایینی فراوانتری پێدان[٣٦١].

---

لێکوشتن، لێرەوە ئیدی هێرشی هەریەك لە هیگۆنۆت و کاتۆلیکەکان بۆ سەر یەکدی دەستیپێکرد تا دواجار جەنگی ناوخۆیی لێکەوتەوە. عبدالحمید البطریق وعبدالعزیز نوار، المصدر السابق، ص١٣٥-١٣٦.

(358) J.A. Marriott, Op. Cit., P.118.

(٣٥٩) ئەم رووداوە ٢٥ی ئاب، لە پاریس روویدا لە رۆژی ئاهەنگی ژنگواستنەوەی (هێنری ناڤار)ی کە سەرکردەیەکی هیگۆنۆتەکان بوو، لەو شەوەدا ژمارەیەکی زۆر لە هیگۆنۆتەکان لە پاریس کۆبووبوونەوە، پاشا و کاتۆلیکەکان هەولّی تیرۆرکردنی سەرکردەیەکی هیگۆنۆتیان دا، بەلاّم هەولّەکەیان سەرکەوتوو نەبوو و ئاشکراش بوو، بۆیە لە بەرەبەیانی ئەو شەوەدا دەستیانکرد بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە هیگۆنۆتەکان لە پاریس و دواتر ناوچەکانی تریش:Thomas M. Lindsay, Vol.2, PP.198-200.

(360) Ferguson and Bruun, Op. Cit., P.417; Schevill, Op. Cit., PP.203-204.

(٣٦١) ارنست بلوخ، المصدر السابق، ص٣٢؛ Ferguson and Bruun, Op. Cit., P.419.

## باسی چوارەم:

## جیاوازی نێوان پرۆتێستانتییەکان و دەرکەوتنی بزووتنەوە ریفۆرمخوازییە رادیکالەکان.

**تەوەرەی یەکەم: هاورایی و ناکۆکی پێشەنگانی بزووتنەوەی پرۆتێستانتی**

پرۆتێستانتییەکان هەرچەندە لە زۆربەی هێڵە گشتی و سەرەکییەکاندا کۆك و هاوبەش بوون، وەك دژایەتیکردنی دەسەڵاتی پاپا و پێداگری لەسەر بە تاکە سەرچاوە زانینی کتێبی پیرۆز بۆ هەڵهێنجانی یاسا و رێساکانی ژیان لە جیهانی مەسیحی و پشت بەستن بە باوەڕی باش لە بری کاری باش بۆ دەستەبەرکردنی لێبوردنی یەزدان، هەروەها رەتکردنەوەی رەبەنی پیاوانی ئاینی و دێرەکان و پسولەی لێبوردن و پەرستنی ئایکۆن و سانتەکان و (سانت. مەریەم) و رۆڵی پێکبەستانەی پیاوانی ئاینی لە پەیڕەوی ئاینیدا و ... هتد[٣٦٢]، کەچی لە وردەکارییە تیۆلۆجی و زۆرێك لە کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا بە پێی کات و شوێن و ئاست و جۆری رۆشنبیری هەریەك لە پێشەنگەکان ناکۆکی و جیاوازی دەردەکەوت.

(لوتەر) کە لە رووی مێژووییەوە کارەکانی دەسپێکی ئەم بزووتنەوەیە بوون و لە ناوچەی ئەڵمانیای پەرتەوازە و تامەزرۆی دەسەڵاتێکی ناوەندییەوە دەرکەوت و میرەکانی کرد بە پشت و پەنا، بۆ خۆیشی راهبێك بوو کە هزری هیومانیستەکان زۆر بە کەمی کاریگەرییان لەسەر

---

(٣٦٢) رولان موسنییه، القرنان السادس عشر والسابع عشر، ص٨٥؛ کابان عبدالکریم احمد، الاصلاح الدینی في المسیحیة مقارنة بالاصلاح الفکري في الاسلام، رسالة ماجستیر، کلیة الشریعة والدراسات الاسلامیة، جامعة صلاح الدین-اربیل، ٢٠٠٢، ص٨٦-٨٨؛ Hayes, Modern Europe..., P.174; Palmer,Op.Cit., PP.88-89.

هزر و بۆچوونی دانابوو، بۆیە پتر کۆنەپارێزی بە بۆچوونەکانییەوە دیاربوو بە بەراورد لەگەڵ هەریەك لە (زوینگلی) و (کالڤن) کە لە رۆژگارێکدا دەرکەوتن ناوچەی پرۆتێستانتی لە ئارادابوون [٣٦٣] و هەریەك لەمانە بە توندی لە ژێر کاریگەری هزری هیومانیستەکاندا بوون، تایبەت (کالڤن) کە دوای پتر لە بیست ساڵ لەوانی پێشخۆی چالاکییەکانی دەستپێکرد، کە پێشهاتە فیکری و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان جیاوازبوون، بۆیە جیاوازی بە کارەکانییەوە دیارە لەچاو کارەکانی (لوتەر) و پتر بۆچوونەکانی لەگەڵ بەرژەوەندی شارنشینەکاندا یەکیاندەگرتەوە.

کێشەی گۆڕانی نان و مەی لە مەراسیمی (شامی خوایی)دا بۆ خوێن و گۆشتی مەسیح یەکێکە لە کێشە تیۆلۆجییەکانی نێوان ئەم پێشەنگانە کە (لوتەر) لەم بارەیەوە زۆر لە کاتۆلیکییەکان جیاواز نەبوو، ئەو پێیوابوو کە مەسیح لەم مەراسیمەدا بە نهێنی ئامادە دەبێت و لەگەڵ ئەم نان و مەیەدا دەچێتە جەستەی مرۆڤەکانەوە و گیانی خۆی و بەخششە ئاسمانییەکانیان بەسەردا دەپرژێنێت، بەڵام هەریەك لە (زوینگلی) و (کالڤن) ئامادەیی مەسیح و موعجیزەیی ئەم مەراسیمە رەتدەکەنەوە و پێیانوایە نان و مەی هەر نان و مەی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەم مەراسیمە تەنها بە یادەوەرییەکی پیرۆزی سەردەمی مەسیح دەزانن[٣٦٤].

جیاوازییەکی تری نێوان ئەم پێشەنگانە سەبارەت بە پێکهاتە و سنووری دەسەڵاتی کڵێسا بوو، لەم رووەوە (لوتەر) گۆڕانێکی ئەوتۆی لە سیستەمی ئیپسکۆپسی کڵێسا نەکرد، بەڵام کڵێسای ملکەچی دەسەڵاتی دونیایی (میرەکان یان پاشاکان) کرد، کەچی (کالڤن) سیستەمی ئیپسکۆپسی هەڵوەشاندەوە و بەڕێوەبردنی کڵێسای خستە دەست ئەنجوومەنێکی هەڵبژێردراوەوە، بەڵام جەختی لەسەر باڵادەستی باوەڕدارانی مەسیحی بەسەر دەسەڵاتی دونیاییەوە دەکردەوە[٣٦٥]، ئەمانە و جگە لە چەندین جیاوازی تر لە وردەکارییەکاندا کە لێرەدا بواری باسکردنیان نابێت و بەشێکیان لە باسەکانی بەشی سێیەمدا روونەبنەوە.

---

(363) Hase and Maltby, Op. Cit., P.263.

(٣٦٤) رولان موسنییە، القرنان السادس عشر والسابع عشر، ص٩٩؛

Edward Raymond Turner, Op. Cit., P.194.

(365) Edward Raymond Turner, Op. Cit., P.195.

**تەوەرەی دووەم: ڕەوتە ریفۆرمخوازییە رادیکالەکان**

هەڵبەتە کۆی ئەو گۆڕانکارییانەی باسکران و ئەوژمی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە بەرفراوانە لە ناخی کۆمەڵگایەکی فرەچین و توێژەوە سەریانهەڵدا، کە لێوان لێو بوو لە بەرژەوەندییە جیاواز و ناکۆکەکان و چەندین نەتەوە و ناوچەی جیاجیا لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و کەلتووری و سیاسیی لەخۆدەگرت، بۆیە کاتێك گوتارە ئایینییەکان بوونە لە ئەستۆگری ئەم ئەرکە مێژووییە و دوای فەراهەمبوونی ئەو ئازادییە لە خوێندنەوە و راڤەکردنی کتێبی پیرۆز دەیان تێگەیشتن و لێکدانەوەی جیاواز لە سۆنگەی ئەو بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییانەوە دەرکەوتن، ئەمەش وایکرد، کە چەند رەوتێکی زۆر ریشەییتر و رادیکالتر لە بۆچوونە ریفۆرمخوازییەکاندا دەرکەوت، کە مێژوونووسان بە بزووتنەوە ریفۆرمخوازییە رادیکالەکان ناوزەدیان دەکەن.

ئەم رەوتە رادیکالیانە هەر لە سەرەتای ساڵەکانی بزووتنەوەکەی (لوتەر)ەوە دەرکەوتن، ئەویش لە سەر دەستی یەکێك لە لایەنگرەکانی خودی (لوتەر) بەناوی (تۆماس مونتزیر- Thomas Muntzer) (1468-1525ز) ەوە کە پیاوی ئایینی بوو لە ناوچەی سەکسۆنیا، تایبەت دوای ئەوەی ساڵی (١٥٢١ز) لەگەڵ گرووپێکدا چوونە شاری ڤێتەنبرگ و کۆمەڵێك بیرۆکەی ریفۆرمخوازانەی زۆر ریشەییان بۆ (لوتەر) پێشنیارکرد و (لوتەر)یش پێیان رازینەبوو، بەمەش کێشەی فیکری لە نێوان (لوتەر) و (مونتزیر)دا کەوتەوە و دواجار (مونتزیر) لە ڤێتەنبرگ وەدەرنرا[٣٦٦]، لێرەوە ئیدی دەستی بە بلاوکردنەوەی بیروراکانی لە سەرانسەری ئەڵمانیا کرد و بزووتنەوەی (ئەناباپتیست- Anabaptist)ی راگەیاند. ئەناباپتیست کەمانای (نوێکردنەوەی راگیرکردن) دەبەخشێت لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ئەم رەوتە پێیانوایە راگیرکردنی مرۆڤ لە منداڵیدا مەسیحی بوونی ناگەیێنێت، بەڵکو دەبێت ئەم راگیرکردنە لە تەمەنی بالقبووندا بکرێت، بۆیە ئەمانە لایەنگرانی خۆیان راگیر دەکردەوە[٣٦٧].

ئەم بزووتنەوەیە جگە لە بۆچوونە تیۆلۆجییە رادیکالیەکانی، تێروانینێکی رادیکالیان بۆ کێشە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان هەبوو و بانگەشەی دامەزراندنی کۆمەڵێکی یەکسانیان دەکرد و رۆڵی کڵێسا و هەر سروود و پەیرەوێکی ئایینی تریان بە پێویست نەدەزانی، بەو پێیەی کە ئەم

(366) Hayes, Modern Europe…, P. 162; Katherine Leach, Op. Cit., P. 48.

(٣٦٧) سڤین ئێریك لیدمان، مێژووی بیروباوەڕی سیاسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە عەلاء نوری و دلێر میرزا، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٨٢-١٨٣؛ سعد رستم، المصدر السابق، ص١٦٧.

پەیوەندییە راستەوخۆ لە نێوان مرۆڤ و یەزداندا دەبێت، هەر لەم سۆنگەیەشەوە تەواوی دەسەلأت و یاسا و رێسا کۆمەلأیەتییەکانیان رەتدەکردەوە، بۆیە دواجار بەشدارییەکی بەرچاویان لە جەنگی جووتیاری گەورەی ساڵی (١٥٢٥ز) ی ئەڵمانیادا کرد کە تۆماس مونتزر وەك سەرکەردەیەکی دیاری ئەم جەنگە دەرکەوت و هەر لەم جەنگەشدا بەدیل گیرا و لە سێدارە درا[٣٦٨].

ئەم هەڵوێستە رادیکالیە توندە و رەتکردنەوەی تەواوی پێکهاتەی کۆمەلأیەتی و سیاسیی، پێچەوانەی بەرژەوەندی هەر یەك لە کاتۆلیك و پرۆتێستانتییەکان بوو، بۆیە هەردوولا سەرسەختانە کەوتنە قەلاچۆکردن و راوەدوونانیان، بەلأم ئەم زەبر و زەنگە نەیتوانی بەر لە تەشەنەسەندنیان بگرێت[٣٦٩]، ئەوە بوو هەر لەو سەروبەندەدا بوو (جۆن لیدنی- John of Leiden) (1510-1536ز) کە زانایەکی تیۆلۆجی میانڕەو بوو و بانگەشەی فرەژنیی دەکرد، لەگەڵ لایەنگرەکانیدا بوونە ئەناباپەتیست و بۆ ماوەی ساڵێك حوکمڕانی شاری (مانستەر- Münster)ی کرد، بەلأم ساڵی (١٥٣٦ز) دوای ئەوەی ئیپسکۆپسی کاتۆلیکی گێڕدرایەوە بۆ ئەو شارە (جۆن لیدنی) لەسێدارە درا، هاوکات ئەم بزووتنەوەیە رێخۆشکەری دەرکەوتنی چەندین رەوتی تری لەم چەشنە بوو[٣٧٠].

یەکێکی تری ئەم رەوتانە کە پێدەچێت باڵێك بووبێت لە ئەناباپتیستەکان جیابووبێتەوە (مینۆنیت- Mennonites) بوو کە لە لایەن (مینۆ سیمۆنیس- Menno Simonis) ی (١٤٩٢-١٥٥٩ز) هۆڵەندییەوە دەرکەوت، (سیمۆنیس) پیاوێکی ئایینی کاتۆلیکی بوو، بەلأم لە ساڵی (١٥٣٦ز)دا لارێبوو و لە ساڵی (١٥٣٩ز) شدا لە دووتوێی کتێبی (Fundament Book)ەوە بیروڕاکانی بەرجەستەکرد، کە بانگەشەی نوێکردنەوەی راگیرکردن و ساکاری ئایین و جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت، هەروەها رەتکردنەوەی توندوتیژی و سوێندخواردنی دەکرد، کە دواتر بیروڕاکانی لە رۆژهەلأتی ئەوروپا و ئەمریکا لایەنگرانی زۆری بوو[٣٧١].

---

(٣٦٨) رولان موسنييه، القرنان السادس عشر والسابع عشر، ص٨٦؛ سڤین ئێریك لیرمان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٣؛ H. G. Koenigsberger and George L. Mosse, Op. Cit., PP125-126.

(٣٦٩) سعد رستم، المصدر السابق، ص١٦٧.

(370) Hayes, Modern Europe…, P. 162.

(٣٧١) ماكس ڤيبر، الاخلاق البروتستانتية و روح الراسمالية، ترجمة محمد علي مقلد، مراجعة جورج ابي صالح، لبنان، د.ت.، ص٩٥؛ "The New Encyclopedia Britannica", Vol.15, P.552 .

ئەرمینیان Arminianism) ( رەوتێکی تر بوو لەم بزووتنەوە رادیکالیانە کە لەسەر دەستی زانای تیۆلۆجی کالڤنی (جاکوب هیرماسین ئەرمینۆس- Jacob Hermansen Arrminuis) ی هۆڵەندی (١٥٦٠-١٦٥٩ز) دەرکەوت، دوای ئەوەی کەوتە کێشەیەکی تیۆلۆجییەوە لەگەڵ کالڤنییەکاندا دەربارەی بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ ناچارکردنی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی باوەڕ و کردارەکانی رۆژانەدا، (جاکوب) لەبیروڕاکانیدا پێداگری لەسەر سەربەستی مرۆڤ دەکرد لەهەڵبژاردنی باوەڕ و رەفتارەکانی بە پێی ئەو ئیرادەیەی خودا پێیداوە، واتە خودا چارەنووسی مرۆڤی دیاریکردووە، بۆیە پێویست بە بەکارهێنانی توندوتیژی ناکات لەدژی ئەو مرۆڤانەی کرداری خراپ ئەنجامدەدەن، دواتریش بیروڕاکانی بەناوچەکانی هۆڵەندا و ئینگلستان و چەند ناوچەیەکی تردا تەشەنەیکرد[٣٧٢].

بەڵام لە هەموان ریشەییتر (یەکێتیخوازان- Untitrinitarian) یان (سوزینیان- Socinian)ەکان بوون کە هەوڵی پێکهێنانی ئایینزایەکی تەواو عەقڵانی و خاڵی لە دیاردە ئەفسانەیی و موعجیزەییەکانیان دەدا و بانگەشەی رەتکردنەوەی خوایەتی مەسیح و بیرۆکەی (سێکوچکەی-Trinity-ثالوث)یان دەکرد، کە بۆخۆی هەڵگەڕانەوە بوو لە بیروڕای مەسیحییەت[٣٧٣]، بۆیە دامەزرێنەری ئەم بزووتنەوەیە کە پزیشکێکی ئیسپانی بوو بەناوی (مایکل سیرڤیتس- 1511-1553) (Miguile Servetusز) ساڵی (١٥٥٣ز) لە جنێڤ، بەبڕیاری خودی (کالڤن) لە ئاگردا سوتێنرا[٣٧٤]. ئەم رەوتە دواتر لەسەر دەستی هەریەك لە (لیلۆ-Laelio) و (فاستۆ سوزینی-Faustos Socinus)برازایەوە پەرەپێدرا و بۆیە دواتر ئەم رەوتە بە سوزینیان ناسران کە بەڕەچەڵەك ئیتالی بوون و دواتر روویانکردە ناوچەکانی سویسرا و بەتایبەتی فاستۆ سۆزینی دوای مردنی (لیلۆ سۆزین)ی مامی لە ساڵی (١٥٦٢ز)دا ئیتالیای بەجێهێشت و لەناوچەکانی سویسرا دەستی بە چالاکییەکانی کرد و دواتریش ساڵی

---

(٣٧٢) سعد روستم، المصدر السابق، ص ١٧٤- ١٧٥ ؛ W.Gary Cramplon and Richard E. Bacon, Toward a Christian World, Texsas, 2000, PP.60-61.

www.fpcr.org/pdf/TACW.pdf

(373) Hase and Maltby,Op. Cit.,P.262; Hayes, Modern Europe…, P.163 .

(374) " The Camridge Modern History " , Vol.2, P.411.

(١٥٧٩ز) روویکردە پۆڵەندا و بیروڕاکانی دەنگدانەوەیەکی باشی بوو، دواتریش لە زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئەورووپا لایەنگرانی ئەم رەوتە دەرکەوتن[٣٧٥].

یەکێکی تر لەم رەوتە رادیکالیانە لە ئینگلستاندا دەرکەوت لەسەر دەستی (رۆبێرت برۆن- (1550-1633ز Robert Browne) بەناوی (کۆنگریگاشتالیست – Congregationalist)ەوە، لایەنگرانی ئەم گرووپە سەرجەم دەسەڵاتەکانی دەوڵەت و ئیپسکۆپس و پاپایان بەسەر کڵێساوە رەتکردەوە و داوای سەربەخۆیی کڵێسایان دەکرد، بەتێڕوانینی ئەوان کڵێسا پێویستە لەباوەڕدارە مەسیحییەکان پێکبێت و قەشە و پیاوە ئایینییە گەورەکانیش لەڕێی هەڵبژاردنەوە دیاریبکرێن، هەرچەندە لەدوادواییەکانی تەمەنیدا (رۆبێرت برۆن) تاڕادەیەك خۆگونجاندن لەبیروڕاکانیدا دەرکەوت، بەڵام لەئینگلستان رێخۆشکەری بۆ دەرکەوتنی رەوتە رادیکالیەکان کرد[٣٧٦].

هەر لەئینگلستان و لەنێو باوەڕدارە پرۆتێستانتییەکانەوە گرووپێکی تر لەم رادیکالانە دەرکەوت بەناوی( پیۆریتان- Puritan)ەکانەوە، واتە (پاکتاوخوازەکان)، تایبەت دوای ئەوەی کەزۆرێك لە پرۆتێستانتییەکان لەسەردەمی (شاژنە ماری)دا پەناهەندەی ناوچەکانی سویسرا بوون و لەوێ پتر شارەزاییان دەربارەی بیروڕای پرۆتێستانتییەکان پەیداکرد، بۆیە دوای گەڕانەوەیان لەسەردەمی (شاژنە ئەلیزابێس) و دوای راگەیاندنی باوەڕی ئینگلیکانی بەم ریفۆرمە نارازیبوون و داوای گۆڕانکاری ریشەییتریان دەکرد و خوازیاری پاکتاوکردنەوەی کڵێسا بوون لە پاشماوە کاتۆلیکییەکان بۆیە بە پاکتاوخوازەکان ناسران[٣٧٧]، ئەم پیۆریتانانە هەوڵیاندەدا کڵێسایەکی ئەنجوومەنی دامەزرێت و دەسەڵاتی ئیپسکۆپسەکان کەمبکرێتەوە و دواجار کەوتنە کێشەیەکی سیاسیی درێژخایەنەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارییەتی ئینگلستان[٣٧٨].

---

(374) Thomas M. Lindsay,OP. Cit.,Vol. 2, PP. 470-472; Hayes, Modern Europe..., P.164.

(٣٧٥) محمد محمد صالح، المصدرالسابق، ص ٢٠٥-٢٠٦ ؛ Hayes, Modern Europe...,PP.162-163 .

(٣٧٦) سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣ ؛ Alison Wall, Power and protest in England (1525-1640), Arnold, London-New York, 2000, PP.68-69; H. C. Koenigsberger and George L. Mosse, Op.Cit., P.296.

(377) Anthony Toyne, Op. Cit., P.125; G. K. A. Bell, Op. Cit., P.22.

دیاره لە باسەکانی پێشوودا ئەوەمان بۆ روون بووەوە کە بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بۆ خۆی بەشێك بوو لەو گەشەسەندنەی کە بەسەر ژیانی مرۆڤدا هاتبوو و لە رۆژگارێکدا دەرکەوت کە پەیوەندییە ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگییە نوێیەکان تادەهات پتر جێگیر دەبوون و بەرەو کایە جیاجیاکانی ژیان پەلیان دەهاوێشت و تامەزرۆی وەرچەرخانێکی گەورە دەبوون لە تێگەیشتن و جیهانبینینی مرۆڤ و چەمکی ئەخلاق و بەها کۆمەلایەتییەکان تا لەگەڵ رەوشی نوێی ژیاندا بگونجێن، بەمەش ئەم بزووتنەوەیە لە روویەکەوە هەوڵی مرۆڤی ئەو رۆژگارەی ئەو ناوچەیە بووە بۆ رێکخستن و دارشتنەوەی ئەو چەمك و بەها و ئەخلاقە کۆمەلایەتییە نوێیانەی کە لەو کاتەدا ئەوروپا پێیان گەیشتبوو، یان لە هەنگاونان بوو بۆ پێگەیشتنیان و ئەمە هەوڵی راستەقینەی مرۆڤ بوو بۆ ناوزەدکردنێکی دروستی چەمکەکان[379].

بۆیە ئەنجامەکانی ئەم بزووتنەوەیە زۆر لەوە ئالۆزترە کە لە لێکدانەوەی چەند دەق و رووداوێکدا دەرکەوێت، بەلکو ئەمە تاوتوێکردن و لێکدانەوەی سەرلەبەری ئەو ململانێ و پێکداهەلپژانەی ئەو بەرژەوەندییە جیاجیا و پێکهاتە تێکئالۆسکاوەی رەوشی ئالۆزی کۆتایی سەدە نێوەنجییەکانە هەر لە پێکهاتەی چینایەتییەوە بگرە، تا تەواوی پێکهاتە کۆمەلایەتییەکان، تا دەگاتە شێواز و فۆرمی دەسەلاتدارییەتی سیاسیی، چونکە ئەم پێکهاتانە پەیوەندییەکی ئەوتۆ پێکەوەیان دەبەستێتەوە، کە ئەگەر هەر گۆرانێك لە رووکەشدا رووبدات دواجار زنجیرەیەك گۆرانکاری وردی لێدەکەوێتەوە کە سەرەنجام بە رێژەی جیاواز بەشی هەرە گەورەی کایەکانی ژیان دەگرێتەوە.

کەواتە خودی ئەم بزووتنەوەیە بەشێکە لە گەشەسەندنی کۆمەلایەتی و گۆرانی پێ بەپێیە لە فۆرمێکەوە بۆ فۆرمێکی ئالۆزتر کە دواجار دەبێتە مایەی گۆرانکارییەکی بەهەنگاو و بە چەند قۆناغێکی پێکەوەگرێدراودا تێپەردەبێت[380]، هەر ئەمەشە ئەم بزووتنەوەیە لە بەرگی بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتی ـ سیاسیی فرە رەهەند و ئەنجامدا دەردەخات، کە بە تێپەربوونی

---

(379) F.Guizot, Op. Cit., P. 220.

(٣٨٠) دلال ملحس استيتية، التغير الاجتماعي والثقافي، دار وائل للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤، ص٣٥ .

کات لێکەوتەکانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەشی هەرە گەورەی قوژبنەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە و بناغەی توخمەکانی ژیانی نوێ دادەڕێژێت.

ئەمە ئەگەرچی سروشتی بزووتنەوەکە و سەردەمە مێژووییەکەی سەرەتا مۆرکێکی تر بە لێکەوتەکانی ئەم بزووتنەوەیە دەبەخشن و لێکەوتەکانی لە بەرگێکی کاولکارانە و کۆنەپارێزیدا دەردەخەن بەو پێیەی کە وەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکردووە ئەم بزووتنەوەیە بەو تێڕوانینەوە هاتە مەیدان کە تەواوی قەیرانەکان لە چاو گەندەڵی کڵێسا و شیرازەتێکچوونی ژیانی ئایینی بزانن و تەواوی چارەسەرەکانیشیان لە دەقە ئایینییە کۆنەکانەوە سەرچاوەبگرن، کە بۆ سەردەمێکی مێژوویی جیاواز داڕێژرابوون و بەشی هەرەزۆریان لەگەڵ ڕەوشە نوێیەکەدا ناکۆك دەبوون و دواجار زۆرێك لە هەڵویستی ریفۆرمیستەکان دەربارەی بەشی زۆری دیاردە نوێیەکان بارتەقای کڵێسای کاتۆلیکی توندڕەو و کۆنەپارێز دەبوون.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بزووتنەوەیە بوو بەو بزووتنەوەیەی کە بۆ یەکەمجار بەکردەوە توانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی سەدە نێوەنجییەکان بداتە بەر ڕەخنە و پەیتاپەیتا بەدیلەکانی بخاتەڕوو لە ڕۆژگارێکدا کە ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکانی وەك ڕینێسانس و دۆزینەوە جوگرافییەکان و ... هتد، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ عەقڵیان کاراتر دەکرد لە خۆسەپاندن و تەنگهەڵچنین بە ئایین، ئەمەش هەر زوو جۆرێکی تر لە ڕاڤەکاری و شرۆڤەکردنی دەقە پیرۆزەکانی بەسەردا سەپاندن و بە مەبەست و بێ مەبەست زۆرێك لە کارەکانیانی خستە خزمەت پەیوەندییە نوێیەکانەوە، وێڕای ئەوەی کە جەوهەری کێشەکە لەو سەردەمەدا هەوڵی پەراوێز خستنی باوەڕە عەقیدەییەکان بوو لە بەڕێوەبردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و فیکری کۆمەڵگا کە ئەم بزووتنەوەیە جگە لەوەی بە پارچەپارچەکردنی کڵێسا خزمەتێکی گەورەی بەم کێشەیە کرد، هاوکات ڕووداوەکانی تادەهات نەکارایی ئەم باوەڕانەی لەم بوارەدا ڕوونتر دەکردەوە و سەرەنجام بە تێپەڕبوونی کات هەلومەرجی پێگەیشتنی زۆرێك لەو چەمك و بەهایانەی دەڕەخساند کە دەمێك بوو لە ناخی کۆمەڵگادا چەکەرەیانکردبوو، بۆیە بەشی زۆری ئەنجامە گرنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە دوای پتر لە سەدەیەك لە دەسپێکی بزووتنەوەکە و لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکاندا ڕووندەبێتەوە کە هەر ئەمەش وادەکات نەتوانرێت لە دووتوێی تەنها بیروڕای ریفۆرمیستەکاندا پەی بە تەواوی ئەنجام و لێکەوتەکانی ئەم بزووتنەوەیە ببرێت، بۆیە هەوڵدەدەین لەڕێی تاوتوێکردنی تەواوی ڕووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیەوە لێکەوتە و ئەنجامەکانی دەستنیشان بکەین.

## باسی یەکەم:

## ئەنجامە ئابوورییەکان

رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە هەر زوو کۆمەڵێك ئەنجامی راستەوخۆیان بەسەر ژیانی ئابووریدا لێکەوتەوە، بەوەی کە لە وڵاتە پرۆتێستانتییەکاندا تەواوی سەروەت و سامانی کڵێسا لەلایەن میرەکان و پاشاکانەوە زەوتکران و دواتریش چ لە رێی دابەشکردنەوە بووبێت یان کڕین یان کرێ، کەوتنە دەست موڵکدار و بورجوازییەکان و لە پڕۆژەی بەقازانجدا بەکارهاتن، ئەمە جگە لەوەی بە بڕینی ئەو باج و داهاتانەی کە لەو وڵاتانەوە دەچوون بۆ کڵێسا داهاتێکی زۆر بۆ خەڵکی ئەم ناوچانە گەڕانەوە، وێڕای ئەوەی لەم وڵاتانەدا ژیانی ئابووری و بازرگانی لە کۆت و کۆنترۆڵی کڵێسای کاتۆلیکی رزگاریان بوو[٣٨١]، بەمەش وەرچەرخانێکی بەرچاو بەسەر ژیانی ئابووری ئەم ناوچانەدا هات، بۆیە مێژوونووسی بەناوبانگ (ول دیۆرانت) پێیوایە ئەم بزووتنەوەیە لە روویەکەوە دابەشکردنەوەیەکی نوێی سەروەت و سامان بووە[٣٨٢]، سەرەڕای ئەمانە دیاردەی کۆچ و راگواستن و ئاوارەبوون لەئەنجامی رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە، رۆڵێکی گەورەیان گێڕا لە کۆبوونەوەی پیشەگەر و بازرگانەکان لە ناوچە پرۆتێستانتییەکاندا، تایبەت ناوچەکانی ئەسکەندەناڤیا و سویسرا، چونکە بەشی زۆری ئەو پرۆتێستانتییانەی لە وڵات ئاوارە دەبوون لە چینی ناوەڕاست بوون، بەتایبەتی ئەوانەی فەرەنسا، ئەمە جگە لەوەی

---

(٣٨١) محمود خيري عيسى، محاضرات في تاريخ اوربا الاقتصادي، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٥٨، ص٢٩؛ أمين مصطفى عبدالله العفيفي واحمد عزت عبدالكريم، تاريخ اوربا الاقتصادي، الطبعة الثانية، مطبعة العربية - مكتبة الانجلو امريكية، ١٩٥٤،ص٣٥.

Louis Gottschalk and Donald Lach, Op. Cit., P.191.

(٣٨٢) ول واريل ديورانت، دروس التاريخ، ترجمة وتقديم علي شلش، دار سعاد الصباح، الكويت، ١٩٩٣، ص١١٥ .

که ولاّته پرۆتێستانتییەکان میانڕەوتربوون بەرانبەر ئەو یەهودییانەی کە لە ناوچە کاتۆلیکییەکاندا رادەگوێزران، تایبەت ئەوانەی لە ساڵی (١٤٩٢ز) بەدواوە ولاّتی ئیسپانیا وەدەرێنران و بەشێکیان روویانکردە ناوچەکانی تری ئەوروپا، دواتریش دوای دەرکەوتنی ولاّتە پرۆتێستانتییەکان روویانکردە ئەو ناوچانە، کە بەشی هەرە زۆریان بازرگان و پیشەگەر بوون، دواجار ئەم دیاردانە گەشەسەندنێکی ئابووری بەرچاویان خستەوە[٣٨٣]، تایبەت لە بواری کەڵەکەبوونی سەرمایەدا (تراكم رأس المال) و سەرەنجام ئەمانەی باسکران، بوونە تەکانێکی باش لە پرۆسەی بەرجەستەبوونی پەیوەندییە ئابوورییە سەرمایەدارییەکان لەم ناوچانەدا.

بەلاّم خزمەتی راستەقینەی ئەم بزووتنەوەیە بە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەو رۆڵەدا خۆیدەنوێنێ کە ئەم بزووتنەوەیە لە تێکشکاندنی ئەخلاق و چەمکە باوەکاندا گێڕای، ئەوانەی چەند سەدەیەك بوو کڵێسای کاتۆلیکی بە پشتیوانی سیستەمی دەرەبەگایەتی بۆ کار و دابینکردنی بژێوی دایڕشتبوون کە تەواو پێچەوانەی پەیوەندییە نوێیەکان دەکەوتنەوە، بەوەی کە سەرلەبەری پرۆسەی بەرهەمهێنانیان لە دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیاندا بەرتەسك کردبووەوە و هەوڵ و تەقەللاکانی مرۆڤیان تەنها بۆ زامنکردنی رەزامەندی خوا و ژیانی ئەو دونیا سنووردار کردبوو، بەچاوی سووکەوە دەیانڕوانییە بازرگانی و سوخواردنیان (الربا) بە گوناهێکی گەورە دەزانی، هەژارییان بە خواپەرستی و بێگەردی لە قەڵەمدەدا و کۆکردنەوەی سەروەت و سامانیش بە گوناهە[٣٨٤].

بەلاّم گەشەسەندنی بەردەوامی بازرگانی و پیشەگەری دەمێك بوو لەگەڵ ئەم پرەنسیپانەدا کەوتبووە ململانێ و رۆژ لەدوای رۆژ کڵێسا و پیاوەکانی بۆ پاشەکشەکردن لەم هەڵوێستانە و پاساودانەوەی پیشەکانی تر ناچاردەکرد، بۆیە (تۆماس ئەکیۆنس) لە سەدەی سێزدەوە هەوڵی داوە پاساو بۆ قازانجی بازرگانیکردن و کاری هاوبەش بێنێتەوە و پێیوابووە مەسیحییەت کە دەوڵەمەندی ناوێت لە بەر ئەوە نییە، کە سەروەت و سامان بۆ خۆی گوناهبێت و دەبێت خۆی لێ لادەین، بەڵکو چونکە هەڵپەی مرۆڤ بۆ کۆکردنەوەی سامان لە خواپەرستی دووریدەخاتەوە، ئەگەرنا نە سامان بۆ خۆی گوناهە و نە هەژاریش خواپەرستییە، بەڵکو مەبەست ئاکامەکەیە[٣٨٥].

(383) Herbert Heaton, Op. Cit., PP. 218-219.

(384) Henri pirenne, Op. Cit., PP. 13-14.

(٣٨٥) جهينة سلطان العيسى و آخرون، المصدر السابق، ص١٠٧.

بۆیە ئەو پەیوەندییە نوێیانە تادەهات وەك شۆڕشێکی مێژوویی هێندە بەتین و تەوژم دەبوون، کە نە ئەخلاق و نە پیرۆزییە کۆمەڵایەتییەکان نەیاندەتوانی بەریان پێبگرن، بەمەش بەر لەسەدەی شازدە ئەو رۆحە لای بەشێکی کۆمەڵ چەکەرەیکردبوو کە قوربانی بەشێك لە رەوشتە ترادسیۆنەکان و بەها کۆمەڵایەتییەکان بدەن بە ئامانجی بەدەستهێنانی سەرمایە، ئیدی تادەهات دەستبەرداربوونی هەرچی زۆرترە لەبنەما و پرەنسیپ و بەها کۆمەلایەتی و ئایینییەکانی دەسەپاند، کە دواجار بۆ پیاوانی ئایینی و بڕیارانی سەدە نێوەنجییەکان قورس دەکەوت، سەرەنجام سەرجەم هەوڵەکانیان بۆ رێکخستنی ژیانی ئابووری نوێ شکستی دەخوارد و لەچەشنی بەربەست بۆ گەشەسەندنەکان دەردەکەوتن[٣٨٦]، ئیدی کۆمەڵێك ئەخلاق و پرەنسیپ پەرەیاندەسەند، کە دەبوو خزمەت بەشێوازی نوێی ژیانی ئابووری بکات، دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیەش لەو سەروبەندەدا لە رووبەکەوە بۆ خۆی هەوڵێك بوو لەم بوارەدا، بۆیە دواجار بە مەبەست و بێ مەبەست رووداوەکانی کەوتنە دارشتنەوەی زۆرێك لە ئەخلاق و پرەنسیپە ئایینییەکان لە خزمەت پەیوەندییە نوێیەکان و لەگەڵ بەرەوپێشچوونە ئابوورییەکاندا و دەرکەوتنی تێڕوانینە نوێیەکانی مرۆڤ بەرانبەر ژیان ئیدی وەك بیرۆکە دەخزێنە نێو پرەنسیپ و بیروڕای ریفۆرمیستانەوە[٣٨٧] یان زۆرێك لە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە وەك هێزێکی ئازادی بەخش و دەستوالاکەر دەکەوتنە خزمەت چالاکییە ئابوورییە نوێیەکانەوە بێنەوەی ئەم ئاکامە لە لایەن ریفۆرمیستەکانەوە خوازراوبێت، ئیدی ئەم چالاکییە نوێیانە لەگەڵ دەقە ئایینییە کۆنەکاندا کە ئاکە سەرچاوەی ریفۆرمیستەکان بوو، هەروەها لەتەك بەها و پرەنسیپە باوەکاندا کە ریفۆرمیستەکان تا ئەوکاتیش لە ژێر کاریگەرییاندا بوون، ناکۆك دەکەوتن، بۆیە زۆرجار هەڵوێستی ناکۆکیان بەرانبەر بەشێکی ئەو چالاکییانە دەبوو، کە بەپێی کات و شوێنی خۆی ئەم هەڵوێستانە لای (لوتەر) زۆر زەقتر دەردەکەوتن[٣٨٨]، ئیدی لەپاڵ ئەوەشدا کە (لوتەر) لەرێی پێداگری و جەختکردنەوەی لەسەر گرنگی و پیرۆزی راپەڕاندنی ئەرکەکانی رۆژانە و

---

(٣٨٦) خوسیه کازانوفا، الادیان العامة في العالم الحدیث، ترجمة قسم اللغات الحیة والترجمة في جامعة البلمند، مراجعة الادب بولس وهبة، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، ٢٠٠٥، ص٣٨ .

R.H. Tawney, Religion and the Rise of Capitalism, Penguin Books, London, 1966, P. 94.

(387) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 71; R. H. Tawney, Op. Cit., P. 94.

(388) Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 71; R7. H. Tawney, Op. Cit., P. 94.

دابینکردنی بژێوی بە ئارەقەی نێوچەوان و بە پیرۆز زانینی هەندێك پیشە و بەشەرعی زانینی بازرگانییەکی بێ فرت و فێڵ[٣٨٩]، هەروەها تێکشکاندنی دەسەڵاتی کڵێسای کاتۆلیکی بەسەر ژیانی ئابوورییەوە بووە رەچەشکێن و رێخۆشکەری بۆ ئەوانی دوای خۆی کرد لە تێکشکاندنی بەها و پرەنسیپەکانی سەدە نێوەنجییەکان، هاوکات هێرشێکی توندی دەکردە سەر زۆرێك لەو دیاردە و چالاکییە نوێیانە وەك قۆرغکردنی بازاڕ و یاریکردن بە نرخ و کێش و قۆستنەوەی جەنگ و ئاشووب بۆ قازانجی بازرگانی و سوخواردن و بانکەکان وەك تۆخمێکی گەندەڵی و لارێبوون لەرەوشت بەرزی لەقەڵەمیدەدان و وەك دیاردەیەکی دەستی کڵێسای کاتۆلیکی مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن[٣٩٠]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە کارەکانی ئەم بزووتنەوەیە بەتەواوی سنوورەکانی ئایینی نەبەزاندبوو، کەچی دواجار هەروەك زانای کۆمەڵناسی گەورەی ئەڵمانی (ماکس ڤیبەر) دەڵێت: ئەخلاق و پرەنسیپەکانی ئەم بزووتنەوەیە، بەتایبەتی کالڤنییەکان و پیۆریتانەکان، خزمەتێکی گەورەیان بە رۆحی سەرمایەداری کرد[٣٩١].

(کالڤن) بەو پێیەی لەتەمەندا لە (لوتەر) بچووکتر بوو و ژیانی پتر لە شارە گەورەکاندا بەسەربردبوو، کارەکانی لەکاتێکدا دەستیانپێکرد، کە پەیوەندییە ئابوورییە نوێیەکان پتر خۆیان سەپاندبوو و لایەنگرەکانیشی زۆرتر لە چینی ناوەڕاست بوون، ئەمەش خۆگونجاندنێکی پتری بەسەر کارەکانی (کالڤن)دا سەپاند، بۆیە بیر و بۆچوونەکانی (کالڤن) کە دواتر بوون بە ماکی بیروڕای پیۆریتانەکان بە کردەوە کەوتنە خزمەت بیر و کرداری شێوازی نوێی ژیانی ئابووری و سەرەنجام بوون بە یەکەم رەوتێك لە ئایینی مەسیحیدا کە پێکەوەگریدانێك لە نێوان شێوازی نوێی ژیانی ئابووری و فیکری مەسیحیدا بکات[٣٩٢].

ریفۆرمیستەکان بۆ خزمەتکردنی ژیانی نوێی ئابووری هەر زوو کەوتنە شرۆڤەکردن و زیندووکردنەوەی ئەو دەقانەی کە بایەخ بەکارکردن دەدەن و کۆمەك بە بیرۆکەی بە پیرۆز زانینی کار دەکەن تا لێرەوە پتر پاساوی شەرعییەت پێدانی پیشە و چالاکییە ئابوورییە نوێیەکان پشت

---

(389) R. H. Tawney, Op. Cit., PP. 101, 103-104.

(٣٩٠) عبدالفتاح العزيزى. "د. محمد رامز"، تحريم الربا في الاسلام والديانتين اليهودية والمسيحية، دار الفرقان للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٤، ص٤٠- ٤٢ ؛ علاء الدين خروفة، الربا والفائدة في الشرائع الاسلامية واليهودية والمسيحية وعند الفلاسفة والاقتصاديين، مطبعة السجل، بغداد، ١٩٦٢، ص٤٦-٤٨ .

(٣٩١) ماكس ڤيبر، المصدر السابق، ص١٣٤-١٣٥.

(392) J. Leslic Dunstan, Protestantism, New York, 1962, PP. 163-164.

ئەستور بکەن و لەم سۆنگەیەشەوە خێرا ئەو وتەیەی (سانت. پۆل) زیندوودەکەنەوە کە دەڵێت: "ئەو مرۆڤەی کار رەتدەکاتەوە دەبێت خواردنیش نەخوات"(٣٩٣) و لێکدانەوەیەکی نویٚ بۆ ئەو بیرۆکەیە دەکەن کە بە (Sabbath) ناسراوە و دەڵێت خوا لەشەش رۆژی کارکردنی بەردەوامدا ئەم گەردوونەی دروستکردوە و لە رۆژی حەوتەمدا پشووی داوە، بۆیە دەبێت مرۆڤیش هەمان رێچکە بگرێتەبەر(٣٩٤)، ئەمانە و چەندینی تر دەخەنە خزمەت بە پیرۆز زانینی کار و پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن، کە خوا مرۆڤەکانی بۆ ئەنجامدانی کارەکان تەرخانکردووە و مرۆڤیش بە ئەنجامدانێکی بە پەرۆشانەی ئەم کارە پێگە و پیرۆزی خوا بەرزتر رادەگرێت و ئەمەش بۆ خۆی گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریکردنی فەرمانەکانی خوایە، بەڵام تەمەڵیکردن و جێبەجیٚ نەکردنی ئەم کارە سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی خوایە(٣٩٥)، دواتریش ئەمە دەبێتە مۆرکێك و لە بەرهەمی بەشی هەرە زۆری پیۆریتانەکاندا رەنگدەداتەوە، (ریچـــارد باکستەر) یەکێکە لەوانەی کە (ماکس ڤیبەر) بە نموونە دەیهێنێتەوە، تایبەت لە کتێبی رێنماییەکانی مەسیحی (Christian Directory) راشکاوانە ئەوە دووپاتدەکاتەوە، کە ئەرکی هەموو مەسیحییەکە بەدرێژایی رۆژ کاربکات، ئەو کارەی کە لای خواوە هاتووە، جەختیشی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە بەرز و پیرۆز راگرتنی خوا بە بێکاری و رابواردن نابێت، بەڵکو بە کۆشش و هەوڵدان دەبێت(٣٩٦)، ئیدی کارکردن دەخەنە خانەی خواپەرستی و فەرمانبەردارییەوە و هەژاریش بەپێچەوانەوە، هەر لێرەشەوە بازرگانی و چالاکییە نوێیەکان وەك خزمەتێکی کۆمەڵایەتی و بەشێك لە خواپەرستی لە قەڵەمدەدەن(٣٩٧) و راشکاوانە رایدەگەیێنن، کە پێویستە مرۆڤی مەسیحی بە هەموو جۆرێك توانای فیکری و جەستەیی و سەروەت و سامانەکەی لە هەر

---

(٣٩٣) بڕوانە: ماكس ڤيبر، المصدر السابق، ص١٣٦. الرسالة الثانية الى اهل تسالونيكي، ٣/١٠.

(394) W. Gary Crampton and Richard E. Bacon, Toward A Christian Worldview, Dallas, 2000, PP. 50-51. www.fpcr.org/pdf/TACW.pdf.

(٣٩٥) رولان موسنيية، القرنان السادس عشر والسابع عشر، ص١٠٨-١٠٩؛

JomesWestfall Thompson, Op. Cit., P. 501.

(٣٩٦) ماكس ڤيبر، المصدر السابق، ص١٣٤- ١٣٥.

(397) Arthar P.Watts, Op. Cit., P. 72; R. H. Tawney, Op. Cit., P. 114.

بوارێکدا بێت بخاتە گەڕ، تەنانەت دەوڵەمەندەکانیش بێکار دانەنیشن لە پێناو خزمەتی گشتیدا[٣٩٨].

وێڕای ئەوەی بەلای ئەمانەوە سەروەت و سامانی زۆر ئیرادە و بەخششی خوایە و هەژاریش کە زۆرجار ئەنجامی تەمەڵی و کارنەکردنە سزا و غەزەبی خوایە، جگە لەوەی ریفۆرمیستان جەختێکی زۆریان لەسەر سادە و ساکاری ژیان و دەستگیرۆییکردن و بە فیڕۆنەدانی سەروەت و سامان لە رابواردن و زێدەڕۆیی نەکردن لە خواردن و جل و بەرگ دەکردەوە، ئەگەر دواجار ببنە مایەی کەڵەکەبوونی سامان[٣٩٩]، بەمەش خزمەتێکی گەورەی بە پرۆسەی کەڵەکەبوون و کۆبونەوەی سەروەت و سامان کرد.

لەلایەکی تریشەوە سوخواردن کە تادەهات پتر وەك پێداویستییەکی گەورەی بەرەوپێشچوونی ژیانی نوێی ئابووری خۆی دەسەپاند، هەرچەندە بە توندی لە کەلتوور و فیکری پیاوانی ئایینی پێش (کالڤن)دا قەدەغەکرابوو، بۆ یەکەمجار لای (کالڤن) بە زۆر شێوە رێپێدراو کرا، کە دواجاریش رۆڵێکی گەورەی لە گەشەسەندنی شێوازی ئابووری سەرمایەداریدا گێڕا.

(کالڤن) ئەو سوودەی خاوەن قەرز بەرانبەر ئەو پارەیە وەریدەگرێت، کە لەکردارێکی بازرگانیدا بەکاردێت، بەشەرعی دەزانی و وەك هاوبەشی (شەریکی) لە قەڵەمیدەدا[٤٠٠] و پێیوایە ئەو سوودەی وەریدەگرێت وەك ئەوەیە، کە خاوەن پارە بەو پارەیە خانوو یان کێڵگە بکرێت و بە کرێیبدات و لەم رووەوە دەڵێت: "بۆ دەبێت رێ بە خاوەن برێك پارە نەدرێت کە برێکی دیاریکراو سوود بەدەستبێنێت، لە کاتێکدا رێدراوە خاوەن کێڵگەیەکی وشك و برنگ ئەم کێڵگەیە بەکرێ بدات..."[٤٠١]، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەوجۆرە سوە قەدەغە دەکات، کە

---

(٣٩٨) جون هارمان راندل، المصدر السابق، ص٢٤٦. لە ئینگلیزییەکەدا

John Herman Ranall, Op. Cit., P.160

(399) Arthur P. Watts, Op. Cit., P.72; J. Leslic Dunstan, Op. Cit., P. 164; Herbert Heton, Op. Cit., P. 220.

(٤٠٠) عبدالفتاح العزيزي، المصدر السابق، ص٤٧-٤٨.

(٤٠١) مقتبس في: فيليسيان شالاي، تاريخ الملكية، ص٦٩.

دواجار چەوسانەوەی هەژارانی لێدەکەوێتەوە و قەرز وەرگر بەناچاری لە پێناو دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیان وەریدەگرێت[٤٠٢].

بەمجۆرە ئەم بزووتنەوەیە لەرێی تێکشکاندنی چەمکی کار و زۆرێك لە بەها و پرەنسیپە ئەخلاقی و ئایینییەکانی سەدە نێوەنجییەکان و بەرگ پۆشکردنی زۆرێك لە بەهاو چالاکییە ئابوورییە نوێیەکان بە بەرگێکی ئایینی و دارِشتنەوەی چەمکی کار و کۆشش وەك بەشێك لە خواپەرستی، خزمەتێکی گەورەی بە پرۆسەی گەشەسەندن و بەرجەستەبوونی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری کرد، بۆیە دواتریش هەنگاوەکانی شێوازی نوێی ژیانی ئابووری لە وڵاتە پرۆتێستانتییەکاندا خێراتر بوون، ئیدی لەهەر وڵاتێکی فرە ئایینزادا ئەم پرۆتێستانتانە بەردەوام بەشی هەرە زۆری پیاوانی کار و سەرمایەدار و خاوەن دەزگا پیشەسازییەکان و رۆشنبیرانیان پێکدەهێنا[٤٠٣]، دواجار ئەم ئایینزایانە، تایبەت پیۆریتانەکان زەمینەسازییەکی گەورەی بە عەقڵانی بوونی ئابووریيان کرد، ئەمە ئەگەر کەمینە بووبن، یان زۆرینە، کە ئەمە لای کاتۆلیکەکان تێبینی ناکرێت، باشترین نموونەش هیگۆنۆتەکانن، کە گرنگترین فاکتەری گەشەسەندنی پیشەسازی سەرمایەداری بوون لە فەرەنسا[٤٠٤].

---

(٤٠٢) محمود خيري عيسى، المصدر السابق، ص٣٠ ؛ کەمال پۆلادی، مێژووی هزری سیاسی لە رۆژئاوا، وەرگێرانی ئازاد وەڵەدبەگی و سیروان زەندی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٨.

(٤٠٣) ماکس ڤیبر، المصدر السابق، ص١٦.

(٤٠٤) المصدر نفسه، ص١٨-٢٠.

## باسی دووەم:

# ئەنجامە كۆمەڵایەتییەكان

**تەوەرەی یەكەم : ئایینییەكان**

یەكێك لە ئەنجامە راستەوخۆكانی ئەم بزووتنەوەیە ئەو گۆڕانكارییە بوو، كە بەسەر پێكهاتە و شێوازی ژیانی ئایینی ئەو ناوچەیەدا هات، بەوەی هەر زوو ئەم بزووتنەوەیە بووە مایەی پارچەپارچەبوونی ئەو یەك فۆرمی و گشتگیرییە ئایینییەی كە چەند سەدەیەك بوو كڵێسای كاتۆلێكی بەڕێوەی دەبرد و لەپاڵ ئەمدا چەند ئایینزا و گرووپی ئایینی تر دەركەوتن، كە جگە لە كاتۆلیك و پرۆتێستانتەكان تەنانەت خودی پرۆتێستانتەكان بوون بە لوتەری و كالڤنی و ئینگلیكانی و چەندین رەوت و گرووپی رادیكالیش سەریانهەڵدا.

ویڕای ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە بەو پێیەی بەشێك بوو لە گەشەسەندنی ژیانی مرۆڤ و لە ناخیشدا پەیوندییەكی بەتین لە نێوان باوەڕ و گۆڕانی ژیان و كاروباری مرۆڤدا هەیە، بۆیە ئەم بزووتنەوەیە وەرچەرخانێكی گەورەی بەسەر خودی باوەڕ و تێڕوانینی مرۆڤدا هێنا بەرانبەر بە ئاین[٤٠٥].

ئەم بزووتنەوەیە وەك زۆرێك لە مێژوونووس و بیریاران ئاماژەی پێدەكەن لە جەوهەردا هەوڵی ئازادكردنی رۆحی مرۆڤ بووە لە ژیانی ئایینیدا و ریفۆرمیستەكان ئینجیلیان كرد بە بناغەی ژیانی ئایینی و هەموو تاكەكانیان لە خوێندنەوە و راڤەكردنی ئازادكرد، بەمەش بواری دەركەوتنی لێكدانەوە تیۆلۆجییە دژ بەیەك و لێكجیاكانیان خۆشكرد و ئیدی تەواوی

---

(405) J. Leslic Dunstan, Op. Cit., P.35.

پێکهاتەی کڵێسا و پیرۆزییەکانی ژیانیان کردە جێی دانوستاندن و هەڵوەستەکردن[٤٠٦] کە زۆر جار تا کۆڵەگە سەرەکییەکانی ئایینی مەسیحی سەریان دەکێشا وەك ئەوەی لای ئەناباپتیستەکان بەدیدەکرێت.

ئەمە جگە لەوەی کە لەرێی تێکشکاندنی رۆڵی پێکبەستانەی کڵێسا و پیاوانی ئایینییەوە لە پەیرەوە ئایینییەکاندا ئەم بزووتنەوەیە توانی تاکگەرایی ئاوێتەی ژیانی ئایینی بکات، کە دواتر بووە توخمێکی سەرەکی ژیانی نوێی کۆمەڵگا و کاردانەوەی بەسەر تەواوی کایەکانی ژیان و رووداوەکاندا هەبوو[٤٠٧].

لەلایەکی تریشەوە ئەم بزووتنەوەیە گۆڕانێکی گەورەی بەسەر شێوازی پەرستن و سروودە ئایینییەکاندا هێنا و پرۆتێستانتەکان زۆرێك لە نەریتەکانی کڵێسای کاتۆلیکییان رەتکردەوە و رێگایان بە بەکارهێنانی زمانی میللی لە پەیرەوە ئایینییەکاندا دا و شێوازێکی سادەیان لە پەرستن و کڵێسایەکی داماڵراو لە ئایکۆن و تابلۆ و پەیکەر داهێنا[٤٠٨]، جگە لەوەی هەر ئەم بزووتنەوەیە کڵێسای کاتۆلیکی ناچارکرد بەشێوازی بەرێوەچوونی کاروبارە ئایینییەکانیدا بچێتەوە و چاکسازییەك لەم رووەوە ئەنجامبدات، کە بە دژە ریفۆرم (الاصلاح المضاد او المعاکس) ناسراوە.

**تەوەرەی دووەم : دژە ریفۆرم**

سەرکەوتنی پرۆتێستانتەکان لە لایەك و گۆڕانکارییە فیکری و کۆمەڵایەتییەکان لەلایەکی تر کڵێسای کاتۆلیکییان تەواو ناچاری بە خۆداچوونەوە و نۆژەنکردنەوەی شێوازی بەرگریکردن کرد و لەم پێناوەشدا دەستیدایە پرۆسەیەکی چڕ لە خۆرێکخستنەوە و چاکسازیکردن کە (کۆمەڵەی جۆزیتی - Society of Jesus) توخمێکی سەرەکی ئەم پرۆسەیە بوو و رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە سەرکەوتنیدا، ئەم کۆمەڵەیە لەساڵی (١٥٣٠ز)ەوە بە پێشڕەوی (ئەگناتیۆس

---

(406) J. Leslic Dunstan, Op. Cit., P.35; Georg Wilhelm Friedrich Hegel, The Philosophy of History, Transalat by J. Sibree, INC, New York, 1956, P. 418.

(407) Hayes and Cole, Op. Cit., P.37; Alasdair Macintyre, A Short History of Ethic. A History of Moral Philosophy from the Homeric Age to the Twentieth Century, 3rd Impression, Routledge and Kegan Paul, London, 1971, PP. 121-124.

(٤٠٨) لەم رووەوە بڕوانە باسی دووەم و باسی چوارەمی بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

لۆیۆلا - (Ignatius Loyola)[٤٠٩]ی بە ڕەگەز ئیسپانییەوە دەستی بە چالاکییەکانی کرد و لە ساڵی (١٥٤٠ز)یشدا مۆڵەتی فەرمی لە لایەن پاپا (پۆڵی سێیەم)ەوە پێدرا[٤١٠]، ئامانجی سەرەکی کارەکانی ئەم کۆمەڵەیە گێڕانەوەی شکۆمەندی و کەلتووری کڵێسای کاتۆلیکی بوو و ڕۆڵێکی گەورەی لە پاراستنی باوەڕی کاتۆلیکی و گێڕانەوەی هەندێك ناوچە بۆ سەر ئەم ئایینزایە هەبوو، جگە لەوەی کە ئەم کۆمەڵەیە هەر لە سەرەتاوە بایەخێکی گەورەی بە بواری ڕۆشنبیری و فیکری دا و لەم بوارەشدا چەندین فێرگە و زانکۆی بەناوبانگیان دامەزراند و هێندەی نەبرد فێرگە و پەیمانگاکانیان بەشێکی زۆری ناوچەکانی گرتەوە، بەتایبەتی ئیسپانیا و ئیتالیا و چەندین بیریار و فەیلەسووفی بەناوبانگیان پێگەیاند[٤١١].

لەپاڵ ئەم کۆمەڵەیەدا ئەو زنجیرە ئەنجوومەنە گشتگیرەی کە کڵێسای کاتۆلیکی لە نێوان ساڵانی (١٥٤٥ بۆ ١٥٦٣ز) دا لەشاری ترێنت (Trent) ی ئیتالیا بەستی، بەشێکی تری ئەو پرۆسەیە بوو، کە تێیدا کڵێسای کاتۆلیکی جەختی لەسەر بەشێکی زۆری پەیڕەوەکانی کردەوە و بڕیاری نەهێشتنی زۆرێك لە گەندەڵییە دارایی و ئیدارییەکانی دا و هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری ئەندامەکانی خۆی دا، جگە لەوەی کە چەندین ڕێ و شوێنی بۆ بەرگریکردن و خۆپارستن گرتەبەر[٤١٢].

بەمجۆرە بزووتنەوەی ریفۆرم وەرچەرخانێکی گەورەی بەسەر ژیانی ئایینی و باوەڕدا هێنا و پەرتەوازەیی ئایینی و فرە ئایینزایی و ستەمکاری ئایینی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

---

(٤٠٩) ئەگناتیوس لۆیۆلا لە ساڵی (١٤٩١ز) لە ناوچەی گیوپۆزیکۆ (Guipuzcoa) لەدایکبووە و تا ساڵی (١٥٥٦ز) ژیاوە، ئەم کابرایە تا ساڵی (١٥٤١ز) لە سوپای ئیمپراتۆردا سەرباز بووە، بەڵام دوای ئەوەی ماوەیەك بە هۆی برینداربوونییەوە لە نەخۆشخانە دەکەوێت و لەو ماوەیەشدا بایەخێکی گەورەی بە خوێندنەوەی سەرچاوەکانی کەلتووری مەسیحی دا و کاریگەرییەکی گەورەیان لێکرد، بڕیاری دا تەواوی ژیانی خۆی بخاتە خزمەت کڵێسای کاتۆلیکییەوە. بڕوانە:

V.H.H. Green, Op. Cit., P. 179; H. G. Koenigsberger and George L. Moss, Op. Cit., P. 159.

(410) E. E. Kellett, Op. Cit., P. 325.

(411) Thomas M. Lindsay, Op. Cit., Vol. 2, PP. 606 - 611; V. H. H. Green, Op. Cit., PP.183-193.

(412) George Clark, Op. Cit., P. 53; Schevill, Op. Cit., P. 136.

**تەوەرەی سێیەم: ستەمکاری ئایینی**

هەرچەندە بەر لەم بزووتنەوەیەش وەك پێشتریش باسی لێوەکراوە ستەمکاری بەشێکی گرنگی لە کەلتووری کلێسای کاتۆلیکی پێکدەهێنا، بەڵام هەر لەگەڵ دەسپێکی ئەم بزووتنەوەیە و دەرکەوتنی فرە ئایینزاییدا ئەم دیاردەیە پتر لەسەدە و نیوێك بووە رەنگرێژکەری بەشی هەرە زۆری رووداوە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان لەو ناوچانەدا و هەر زوو هەریەك لە کلێسا و دەسەڵاتی دونیایی بە توندترین شێوە کەوتنە وێزەی پرۆتێستانتییەکان هەر لە ئیسپانیاوە تا هۆڵەندا و هەنگاریا و فەرەنسا و لە هەر یەك لەم وڵاتانەدا دمارگیری ئایینی چەندین جەنگی ناوخۆیی و قەسابخانەی گەورەی لێکەوتەوە[٤١٣]، ئەمەجگە لەوەی کە پرۆتێستانتەکان لەم رووەوە هیچیان لە کاتۆلیکییەکان کەمتر نەبوو.

ریفۆرمیستەکان ئەگەرچی سەرەتا بانگەشەی ئازادی باوەڕ و رادەربڕینیان دەکرد و (لوتەر) بە ئاشکرا دژ بە کرداری سوتاندن و خەفەکردنی بیروڕا بوو، بەڵام ئەمانە هەمووی تا ئەو شوێنە بڕیانکرد، کە بوون بە خاوەن دەسەڵات، ئیدی لێبوردن و یەکدی قەبوولکردن لەزەینی هیچ یەکێکیاندا نەما و ئەمانیش تا سوتان لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەچوون، کە باوەڕێکی دژ و ناکۆکیان لەگەڵ تێگەیشتنی ئەواندا بۆ ئینجیل ببوایە[٤١٤]، سزای لەسێدارەدان لە سەرجەم ناوچە پرۆتێستانتییەکان دژ بەم کەسانە پیادەدەکرا، (لوتەر) زۆر بەڕاشکاوی بە دەسکردی شەیتان لە قەڵەمیدەدان و بانگەشەی لەناوبردنی دەکردن و لە کوشتنی ئەناباپتیستەکاندا بارتەقای کاتۆلیکەکان توندڕەو بوو[٤١٥]، ئەمە لە کاتێکدا سوتاندنی (سیرڤیتس) بە بڕیاری (کالڤن) دیارترین گەواهیدەری هەڵویستی (کالڤن)ە لەم بوارەدا، بۆیە ریفۆرمیستان لەم بوارەدا ئەوەی کردیان تەنها گۆڕینی دەسەڵاتی کلێسا بوو بە دەسەڵاتی ئینجیل[٤١٦]، بەمجۆرە هەریەك لە کاتۆلیك و پرۆتێستانتییەکان درێغییان نەکرد و زۆر بێ بەزەییانە کەوتنە وێزەی یەکدی و کوشتن و بڕین و ئەشکەنجەدانی لایەنە دژەکانیان بێئەوەی دەست لە ژن و پیر و منداڵ ببوێرن و

---

(٤١٢) لەم رووەوە بڕوانە باسی سێیەم لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆلینەوەیە .

(٤١٣) ج. بيوري، حرية الفكر، ترجمة محمد عبدالعزيز اسحق، لجنة القاهرة للتأليف والنشر، القاهرة، د. ت.، ص٥٦.

(٤١٤) توفيق الطويل، قصة الاضطهاد ....، ص١٠٨- ١١٢؛ ج. بيوري، المصدر السابق، ص٥٦.

(٤١٥) ج. بيوري، المصدر السابق ، ص٥٦.

بە هەموو جۆرێك كەوتنە راگواستن و زەوتكردنی ماڵ و موڵكی یەكدی[٤١٧]، نزیكەی سەدە و نیوێك ئەم رەوشە بەردەوام بوو تا دواجار لەگەڵ رەوتی رووداوەكاندا لێبوردەیی پەیتاپەیتا خۆی داسەپاند.

**تەوەرەی چوارەم : لێبوردەیی ئایینی**

لێبوردەیی ئایینی لەڕاستیدا یەكێك بوو لەو ئەنجامانەی كە دوای پتر لەیەك سەدە لە دەسپێكی ئەم بزووتنەوەیە دەركەوت و بیریاری بەناوبانگ (ج. بیوری) پێیوایە كە بێ ویستی ریفۆرمیستان ئەم بزووتنەوەیە كۆمەكی بەم بوارە كردووە و بزووتنەوەكە بۆ خۆی پشتگیری لە ئازادی ئایینی نەكردووە، بەڵكو ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە لەم بوارەدا كردوویەتی تەنها ئافراندنی دۆزێكی سیاسیی و كۆمەڵایەتی ئەوتۆ بووە، كە دەبوو ئازادی و لێبوردەیی ئایینی فەراهەم بكات[٤١٨].

راستییەكەی بە دەركەوتنی دەمارگیری و ستەمكاری ئایینی لێبوردەیی بۆخۆی بووە پرسێك لە كۆمەڵگا و هێدی هێدی رووداوەكان دەیانكرد بە ویستێكی كۆمەڵایەتی، دەركەوتنی چەند ئایینزایەكی ناكۆك كە لە ململانێی بەردەوامدا بوون و ئەم ململانێیەش تادەهات لاوازتری دەكردن لەلایەك ، لەلایەكی تریش ئەم بزووتنەوەیە راستەوخۆ ئایینی وابەستەی بەرژەوەندییە سیاسییەكان كرد لەژێر سایەی چەند پاشا و میرێكی دونیاییدا كە لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەكانیاندا ئامادەی دەستبەرداربوونی دەمارگیری ئایینی بوون، هەروەها ئاكامە خراپ و كاولكارییەكانی ئەم دەمارگیری و ناكۆكییە ئایینییە و بوونی بە تەگەرەی بەردەم گەشەسەندنە كۆمەڵایەتییەكان، هەموو ئەمانە دواجار كەوتنە خزمەت دەركەوتنی یەكدی قەبوولكردن و لێبوردەیی ئایینی[٤١٩]، بۆیە لە هەرەتی ململانێكاندا ئەم دیاردەیە چەكەرەیكرد، ئەوەبوو هەر لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەوە ئەگەرچی بەو جۆرەش نەبوو ئیمپراتۆر (چارلسی پێنجەم) بە پێی ئاشتینامەی ئۆگسبرگی ساڵی (١٥٥٥ز) دانی بە لوتەرییەكاندا نا و هەر لەكۆتایی ئەو سەدەیەشدا لە فەرەنسا بە پێی فەرمانی نانتسی ساڵی

---

(416) Hayes and Cole, Op. Cit., P. 36.

(٤١٧) ج. بیوري، المصدر السابق، ص٥٦.

(٤١٨) توفیق الطویل، قصة الاضطهاد...، ص١١٨؛ ج. بیوري، المصدر السابق، ص٨٥؛ برتراند رسل، حكمة الغرب. عرض تاریخي للفلسفة الغربیة في اطارها الاجتماعي والسیاسي، سلسلة عالم المعرفة، الكویت، ١٩٨٣، ص٤٠.

(١٥٩٨ز) هیگۆنۆتەکان رادەیەکی زۆریان لە لێبوردەیی ئایینی دەستەبەرکرد[٤٢٠]، ئەمە وێڕای ئەوەی کە هەر لەو سەروبەندەشدا چەند گرووپێکی رادیکالی بانگەشەی لێبوردەیی و ئازادی ئایینییان دەکرد، تایبەت ئەرمینیانی هۆڵەندا و سوزینییەکانی پۆڵەندا، تەنانەت سوزینییەکان بەپێچەوانەی تەواوی ئایینزاکانی تر هەموو جۆرە ستەمکارییەکان رەتدەکردەوە[٤٢١].

بەڵام لە سەرەتای سەدەی حەڤدەوە ئەم دیاردەیە تادەهات پتر دەبوو بە پێویستییەکی کۆمەڵایەتی و دەستەبەرکردنی پتر خزمەتی بە رەوتی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا دەکرد و خوازیارانی لە بەشی هەرە زۆری ناوچەکاندا کەوتنە هەوڵی چەسپاندنی، لە ئینگلستان بە هەموو جۆرێك هەوڵیان بۆی دەدا، بە تایبەتی پیۆریتانەکان جگە لەوەی هەر لەو سەروبەندەدا چەند پێشەنگێکی بەناوبانگی ئەم بوارە وەك (هارنگتن- Harrington) و (ملتون- Milton)و (تایلور -Taylor) دەرکەوتن و هارنگتن راشکاوانە سەرجەم ئازادییە سیاسیی و رۆحییەکانی بە ئازادی ئایینەوە دەبەستایەوە[٤٢٢] و تادەهات ئەم داخوازییانە بەگوڕتر و بەدەسکەوتتر دەبوون تا دواجار دوای پتر لە دوو سەدە لە هەڵکشان و داکشان ئەم دیاردەیە جێی خۆی لە کۆمەڵگای ئەوروپادا کردەوە.

### تەوەرەی پێنجەم : ئازادی بیروڕا و زانست

ئازادی بەمانای رزگاربوون لە کۆت و بەندەکانی سەدە نێوەنجییەکان و دەرەبەگایەتی هەر لەو کاتەوە هەنگاوەکانی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکانی مۆرکرێژکرد کە ئەو پەندە لە نێو خەڵکدا بڵاوبووەوە، کە دەیگوت: "کەش و هەوای شار ئازادی دەبەخشێت"[٤٢٣]، ئەو بیرۆکەیە تادەهات بەرەو فیکر و عەقڵ پەلی دەهاوێشت تا رێخۆشکەری بۆ هەنگاوەکانی ئەم سیستەمە ئابووری و کۆمەڵایەتییە بکات، کە دواجار بەمەبەست و بێ مەبەست دەستەبەرکردنی ئەم ئازادییە بۆ فیکر و عەقڵ بوون بە یەکێك لە ئەرکەکانی ئەم بزووتنەوەیە و ئیدی وەك پێشتر

---

(٤١٩) رولان موسيينه، القرنان السادس عشر والسابع عشر، ص١٠٩.

(٤٢٠) بڕوانە: ج بيوري، المصدر السابق، ص٦٨-٦٩.

(٤٢١) توفيق الطويل، قصة الاضطهاد...، ص١٢٣.

(٤٢٣) ئەم پەندە هەر لەسەرەتای سەدەی سێزدە و بوژانەوەی شارەکانەوە لە نێو گەلانی رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپادا بڵاوبووەوە. بڕوانە. Munro and Sontag, Op. Cit., P. 345 :

باسمانکرد ئازادی ژیانی ئایینی و راڤەکردنی ئینجیل بەپێی عەقڵ بوون بە کرۆکی ئەم بزووتنەوەیە، بۆیە (لوتەر) دەسپێکی کارەکانی بە بەپێوەرکردنی عەقڵ دەستپێدەکات و دەڵێت: "ئەوەی لەگەڵ عەقڵدا یەك نەگرێتەوە بێگومان لەگەڵ خوا دا پتر یەك ناگرێتەوە"[٤٢٤]، تا ئەوڕادەیە عەقڵ بەگرنگ دەنرخێنێت کە بەهۆکاری هەموو شتێکی بزانێت[٤٢٥]، هەروەها (کالڤن)یش بەو ئەندازەیە پێگەی عەقڵ بەرز دەنرخێنێت کە عەقڵی مرۆڤ بە وێنەیەکی راستەقینەی یەزدان بزانێت[٤٢٦].

ئەمە ئەگەرچی سروشتی بزووتنەوەکە و سەردەمە مێژووییەکەی هێندەی نەبرد هەنگاوەکانی عەقڵ و ئازادی بیرکردنەوەیان بە ئاراستەیەکی پێچەوانەی ویست و بیرکردنەوەی پێشەنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە برد بە جۆرێك، کە راشکاوانە لە زۆرێك لە هەڵوێستەکانی پێشوویان پاشگەزبینەوە، تەنانەت (لوتەر) بەر لە مردنی بەچەند ساڵێك بە ئاشکرا عەقڵی بە دوژمنی تەواوی کارەکانی خوا دادەنا[٤٢٧]، نەك هەر ئەمە، بەڵکو زۆرجار هەڵوێستیان لە خەفەکردنی فیکر و دژایەتیکردنی زانست زۆر لە کڵێسای کاتۆلیکی توندوتیژتر دەبوو، بۆ نموونە لە دژایەتیکردنی بیردۆزەکەی (کۆپرنیکۆس -Copernicus)[٤٢٨]، لە مەڕ فەلەکناسیدا کە جەختی لەسەر ئەوە دەکرد خۆر چەقی گەردوونە، نەك زەوی، ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونی کتێبی پیرۆز بوو، کە زەوی بە چەقی گەردوون دەزانی، هیچ یەکێك لە (لوتەر) و (کالڤن) و تەنانەت (میلانکتن)یش کە بە ئاکادیمی ناسرابوو، هەڵوێستێکی لە پاپا میانڕەوتریان

---

(٤٢٤) مقتبس في: عبدالله زاهي الرشدان، تاريخ التربية، دار وائل للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٢، ص٢٧٠.

(٤٢٥) عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٠

Hans Michael Müller, Erfahrung Und Glaube
Bei Luther, JHC, Leipzig, 1929, PP. 13,21.

(426) W.Gary Crampton and Richard E. Bacon, Op. Cit., P. 16.

(٤٢٧) عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٠-٢٧١؛ Hans Michael Müller, Op. Cit., P. 22.

(٤٢٨) کۆپرنیکۆس (١٤٧٣-١٥٤٣ز) پیاوێکی ئایینی پۆڵەندی بوو، لە هەرەتی لاویەتیدا روویکردە ناوچە باشوورییەکانی ئیتالیا و لەوێ ئاشنایەتی بە بیروڕاکانی فیتاگۆرس پەیدا کرد، دوای گەڕانەوەشی بۆ پۆڵەندا لە فراونبرگ درێژەی بەکاری ئایینی خۆیدا، بەڵام هاوکات لە لێکۆڵینەوە فەلەکییەکانی نەکەوت، دواتریش لە کتێبی "لە وەرچەرخانی هەسارە ئاسمانییەکاندا" کۆی ئەو رایانەی روونکردبووەوە، کە رۆژ چەقی گەردوونە نەك زەوی کە تا ساڵی مردنی بڵاونەکرایەوە. برتراند رسل، حكمة الغرب...، ص٥٠.

نەبوو[٤٢٩]، لەم بارەیەوە (لوتەر) دەیگوت: کۆپرنیکۆس "دەیەوێت سەرلەبەری یاساکانی فەلەکناسی ئاوەژوو بکاتەوە، لەکاتێکدا کتێبی پیرۆز ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە، کە یوشەع فەرمانی بەخۆر کردووە بوەستێت، نەك زەوی"[٤٣٠]، (کالڤن)یش ئەو کەسانەی بە کافر لە قەڵەمدەدا، کە ئەم بیردۆزەیە بە ڕاست بزانن و دەیگوت: "ئەوە کێیە زاتدەکات دەسەڵاتی کۆپرنیکۆس لە سەرووی دەسەڵاتی ڕۆحی پیرۆزەوە دابنێت"[٤٣١]، ئەمە جگە لەوەی کە ئەو ڕەوشە ئاشووباوی و پڕ لە جەنگ و دەمارگیرییەی کە ئەم بزووتنەوەیە نایەوە، هەروەها توندوتیژی و چاودێری لەسەر چاپەمەنی کە بڕیاری لەسێدارەدان بوو بۆ ئەو کەسەی بێ مۆڵەتی فەرمی کتێب لەچاپبدا لە بەشی هەرە زۆری وڵاتە کاتۆلیکی و پرۆتێستانتیەکاندا پیادەدەکرا[٤٣٢]، ڕۆڵێکی گەورەیان لە تیرۆری فیکر و دواجار بەربەستکردنی هەنگاوەکانی پێشکەوتنە زانستییەکاندا گێڕا، ئەمانەش مۆرکێکی نێگەتیڤانەیان بە هەنگاوە سەرەتاییەکانی ئەم بزووتنەوەیە بەخشی، بۆیە ژمارەیەك لە هزرڤان و مێژوونووسان ئەم بزووتنەوەیە بە دەرچوون لەو هێڵی گەشەسەندنی عەقڵ و زانستەی کە ڕێنێسانس گرتبوویەبەر دەزانن[٤٣٣].

لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا هەر ئەم بزووتنەوەیە بوو، کە بۆ یەکەمجار دەرگای بۆ دانوستاندن و مشتومڕە تیۆلۆجییەکان والآکرد و بەپێوەرکردنی عەقڵی لە کێشە تیولۆجییەکاندا ورووژاند، بۆنموونە (لوتەر) کە هێرش دەکاتە سەر پسولەی لێبوردن لەو ڕوانگەیەوەیە کە لەگەڵ عەقڵدا نایێتەوە، لێرەشەوە ئەم بزووتنەوەیە مۆرکی سەدە نێوەنجییەکانی تێکشکاند و کۆتایی بە دەسەڵات و کۆنترۆڵی ڕەهای کڵێسای کاتۆلیکی هێنا بە سەر ڕۆح و باوەڕی مرۆڤدا و دواجاریش ڕەوتی ڕووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە تادەهات کۆمەکیان بە لاوازبوونی کڵێسا دەکرد و پەیتاپەیتا

---

(٤٢٩) عبدالله المشوخي، موقف الاسلام والكنيسة من العلم، مكتبة المنار، الاردن، ١٩٨٢، ص١٦١؛ الشيخ محمد عبده، الاسلام والنصرانية مع العلم والمدنية، الطبعة الثامنة، دار المنار بمصر، القاهرة، ١٣٧٣هـ، ص٤٠-٤١.

(٤٣٠) اندرو ديكسون وايت، بين العلم والدين، ترجمة اسماعيل مظهر، دار العصور، مصر، ١٩٣٠. بە وەرگرتن لە عبدالله المشوخي، المصدر السابق، ص١٦٢.

(٤٣١) مقتبس في: عبدالله المشوخي، المصدر السابق، ص١٦٢.

(٤٣٢) بڕوانە: ج. بيوري، المصدر السابق، ص٦٥- ٦٦ ؛ دونالد ر. كيلي، المصدر السابق ، ص٢٥٩ ؛ توفيق الطويل، قصة النزاع بين الدين و الفلسفة، الطبعة الثانية، مكتبة مصر، القاهرة، د. ت.، ص١٦١.

(٤٣٣) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء السادس من المجلد السادس، ص٢٦١.

هێزە ئایینییەکانیان ناحەزتر دەکرد و مرۆڤیان لێیان بەگومانتر دەکرد[٤٣٤]، لێرەشەوە هێدی هێدی ئازادییەکان لە بۆتەی ئەو ئازادی و لێبوردنە ئایینییەوە، کە پێشتر باسکران چەکەرەیاندەکرد و دواجاریش ئازادییە ئایینییەکان دەکەوتنە خزمەت ئازادییە کۆمەڵایەتییەکانی تر کە پەیوەندییەکی بەتین پێکەوەیان دەبەستێتەوە[٤٣٥]، ئەوەتا هەر لە سەدەی حەڤدەدا و ساڵی (١٦٤٤ز) (میلتون - Milton) لەو نامەیەیدا کە بە ناوی (ئاریوپاچتیکا)ەو سەبارەت بە ئازادی چاپەمەنی بڵاویکردۆتەوە، ئازادی فیکر و گوتن لەسەرووی ئازادییە مەدەنییەکانەوە دادەنێت و دەڵێت: "ئازادی زانین و دەربڕین و گفتوگۆی ئازادم پێ ببەخشە، بەو پێیەی ویژدانم ئاسوودە دەکات، ئەمە بەلای منەوە لە سەرجەم ئازادییەکانی تر پڕ بەهاترە"[٤٣٦]، بەمەش هێدی هێدی ئازادییەکانی فیکر و گوتن لە وڵاتانی ئەوروپا خۆیان دەسەپاند، دواتریش هەر ئەم ئازادییانە زەمینەسازییان بۆ پێشکەوتنی زانست دەکرد، بەو پێیەی کە رزگاربوون لە کۆت و بەندە عورفی و نەریتییەکان مەرجێکی گەورەی پێشکەوتنی زانستن[٤٣٧]، ئیدی لە وڵاتە پرۆتێستانتییەکانەوە بەر لە کاتۆلیکییەکان هەنگاوە خێراکانی ئازادی فیکر و دەستواڵابوونی عەقڵ و چالاکییە زانستییەکان دەستیانپێکرد[٤٣٨].

**تەوەرەی شەشەم : مێژوو**

مێژوو یەکێك بوو لەو کایە مەعریفییانەی کە بە خێرایی ئەنجامەکانی ئەم بزووتنەوەیە گرتیانەوە، چونکە ریفۆرمیستان سەرەتای کارەکانیان بەگەڕان بە شوێن سەرچاوە دێرینەکانی ئایینی مەسیحی و تاوتوێکردنیان دەستپێکرد و لەم سۆنگەیەشەوە تەواوی سەرچاوەکانیان خستە ژێر تیشکی رەخنە و دانوستاندنەوە بەخودی جۆرەکانی ئینجیلیشەوە، لەم بوارەشدا لەرێی لێکدانەوە و هاوتاکردنی رووداو و کات و شوێنەکانەوە چەندین راستی مێژوویی

---

(٤٣٤) محمد حسين هيكل، الايمان و المعرفة و الفلسفة، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٤، ص٢٢ ؛ محمد علي فروغي، سير حكمت در اروپا. از زمان باستان تاماته هفدهم، جلد اول، انتشارات صفى عيشاه، ١٣٧٩ هەتاوی، ل١٢٦-١٢٧ .

(٤٣٥) ج. بيوري، المصدر السابق، ص٦٦.

(٤٣٦) مقتبس في: توفيق الطويل، قصة النزاع ....، ص١٦٢.

(٤٣٧) كرين برينتون، المصدر السابق، ص٧٨.

(438) F.Guizot, Op. Cit., P. 224.

چەواشەکراویان دەرخست [٤٣٩]، بەمەش گەشەیەکی گەورەیان بە شێوازی نوێی خوێندنەوە و نووسینەوەی مێژوویی و رەخنەی مێژوویی دا.

لەلایەکی تریشەوە پرۆتێستانتەکان بایەخێکی گەورەیان بە خوێندنەوەی مێژوو و تۆمارکردن و گەڕان بە شوێن رووداو و مێژووی خۆیان دەدا بۆ خۆ جیاکردنەوە لە کاتۆلیکییەکان و هەر زوو مێژوو لە ناوچە پرۆتێستانتییەکاندا لە فێرگە و قوتابخانەکاندا وەك بابەتێکی سەرەکی دانرا، لەم بوارەشدا هەر لە سەدەی شازدەوە دوو مێژوونووسی لوتەری بەناوبانگ دەرکەوتن ئەوانیش (لیوهان کاریۆن) و (یوها سلیدان) بوون، کە کتێبەکانیان لە قوتابخانەکاندا دەخوێندران[٤٤٠]، جگە لەوەی هەریەك لەو گرووپە ئایینییە ناکۆکانە مێژوویان وەك ئامرازێکی کارای پشت ئەستورکردنی خۆیان لە رووبەڕووبوونەوەی نەیارەکانیاندا بەکاردەهێنا، لێرەشەوە وێرای ئەوەی بایەخی مێژوو و رەخنەی مێژوویی زۆرتر دەبوو، هاوکات زۆرێك لەم لایەنانە پەنایان دەبردە بەر چەواشەکردنی مێژوویی (المفارقة التاريخية) لە پێناو سەلماندنی بۆچوونە تیۆلۆجییەکانیان، تایبەت دوای دەرکەوتنی دژە ریفۆرم کە کتێبەکەی (گلیۆد - G. A. Giliod) کە ساڵی (١٥٦٤ز) لەچاپیداوە نموونەیەکی زیندووە لەم رووەوە دەیان چەواشەکاری زەقی تێیدایە سەبارەت بە سەردەم و ژیانی سانتەکان[٤٤١].

### تەوەرەی حەوتەم : فەلسەفە

کایەی فەلسەفیش یەکێك بوو لەو بوارانەی تری ژیان کە کەوتە ژێر کاریگەری ئەنجامەکانی ئەم بزووتنەوەیەوە، چونکە وەك تەواوی لایەنەکانی تر فەلسەفەی سەدە نێوەنجییەکان و کڵێسای کاتۆلیکی چیدی نەیدەتوانی بەسەر بیرۆکە و پرسە فەلسەفییە نوێیەکاندا سەروەر بێت، بۆیە لە کاتێکدا کە (رێنێسانس) بە ئاراستەیەکی نائایینییەوە شەڕی ئاشکرای لە دژی بیروڕا عەقیدەییەکانی کڵێسا دەستپێکرد بوو و رێخۆشکەری بۆ هەنگاوەکانی عەقڵ دەرکرد، هاوکات ئەم بزووتنەوەیە لە نێو خودی کڵێسا و باوەڕە تیۆلۆجی و عەقیدەییەکاندا شەڕێکی

---

(٤٣٩) بڕوانە:

Peter Burke, The Renaissance Sense of the Past, Edward Arnold, London, 1969, PP. 59-65

(٤٤٠) دونالد ر. كيلي، المصدر السابق، ص١٨١.

(٤٤١) بڕوانە: Peter Burke, Op. Cit., P. 28.

توندی نەریتەکانی هێنایە ئاراوە[٤٤٢] کە لەم شەڕەشدا عەقڵ وەك پێوەرێك دەرکەوت و گرووپە ئایینییە جیاجیاکان بەو پێیەی لەگەڵ عەقڵدا ناکۆك دەبوو لایەنە زۆر هەستیارەکانی ئایینی مەسیحییان دەکردە جێی رەخنە و دانوستاندن کە هەندێك جار ئەم ئاراستانە خۆی لە قەرەی ئیلحاد دەدا، تایبەت سوزینییەکان کە لە یەکێك لەو نامانەدا (لیلیۆ سوزینی) ئاراستەی (کالڤن)ی کردووە راشکاوانە دەڵێت: "زۆربەی هاورێکانم گەیشتوونەتە ئاستێکی بەرزی فێربوون و زانین بە جۆرێك کە بەشی زۆریان نزیکە باوەڕیان بە بوونی خوا نەمێنێت"[٤٤٣]، هەر ئەم نەسازی و مشتومڕە تیۆلۆجییانەش مشتومڕی فەلسەفی بەدوای خۆیدا هێنا و دواجاریش لاوازبوونی عەقیدەکان و کڵێسا پتر مەیدانیان بۆ عەقڵ چۆڵدەکرد و ئیدی خاوەن فیکران بەجۆشتر و تێڕوانینە(تأمل) فەلسەفییەکانیش بەگوڕتر دەبوون، سەرەنجام ئەوەی لە تەواوی ئەم ململانێیانەدا هاتەئاراوە بەشەڕەکانی رێنێسانسیشەوە بریتیبوو لە جیابوونەوەی فەلسەفە لە تیۆلۆجیا کە لای ئۆکهامەوە سەرەتای گرتبوو، ئیدی رۆژ لە دوای رۆژ فەلسەفە وەك زانستێکی دونیایی سەربەخۆ دەبوو و هاوکات ئەرکە راستەقینەکەی وەك مەعریفەیەکی سروشتی جێگیر دەبوو[٤٤٤]، لێرەشەوە مشتومڕی نێوان گریمانە و سەلماندنەکان و رەوتە فەلسەفییەکان بە پێی لۆجیکی عەقڵ خۆیان دەسەپاند و تادەهات نەگونجانی نێوان عەقڵ و باوەڕە عەقیدەییەکانی روونتر دەکردەوە و دواجار پیاوانی ئایینی و کڵێساکانی لەو کێشە فیکری و زانستییانە دوور دەخستەوە[٤٤٥] و هەر لە سەدەی حەڤدەوە چەند بیریار و فەیلەسووفێك دەرکەوتن کە عەقڵیان لە ئایین بەکاراتر دەزانی بۆ گەیشتن بـــە راستییـــە

---

(442) Willhelm Windelbond, Lehrbnch der Geschich der Philosophy, Tübingen, 1912, P.295.

(٤٤٣) مقتبس في: رمسيس عوض، الالحاد في الغرب، سينا للنشر- مؤسسة الانشاء العربي، القاهرة - بيروت، ١٩٩٧، ص٢٤.

(444) Willhelm Windelbond, Op. Cit., P. 295.

(٤٤٥) محمد حسين هيكل، المصدر السابق، ص٢٣.

زانستییەکـان کە بە روونی لای (فرانسیـس بیکۆن - Francis Bacon)[٤٤٦] و (دیکارت - Rene Descartes)[٤٤٧] دەردەکەوێت و هێدی هێدی بە نێو کۆمەڵدا رۆدەچێت و دەسەڵاتی ئایین سەرولێژ دەکاتەوە[٤٤٨].

جگە لەوە (لوتەر) بەو پێیەی کارەکانی بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە دێرینەکانی مەسیحییەت دەستپێکرد، پێدەچێت توخمە بوونگەراییەکانی (الوجودیه- Existentialism) کەلتووری مەسیحی بەتایبەتی (سانت. پۆل) و (سانت. ئۆگستین) زۆر کاریان تێکردبێت، بۆیە تێڕوانین و پرەنسیپەکانی بەڕوونی توخم و تایبەتمەندییەکانی بوونگەراییان پێوە دیارە[٤٤٩]، بەمەش بیروڕاکانی (لوتەر) دواجار خزمەتێکی گەورەیان بەم رەوتە فەلسەفییە کرد، کە رەنگە هەر ئەمەش وایکردبێت (پۆل تلش) کاتێك کە دەڵێت فەیلەسوفە بوونگەراکان تەنها ئەو پرسیارانە دەوروژێنن، کە لە بووندا هەیە وەڵامەکان لە تیۆلۆجیاوە وەردەگرن، پێیوابێت کە فەیلەسوفی بوونگەرایی گەورە (سیرن کیرکەگۆر -S. Kierkeguard) (1813-1855ز) کە بە باوکی بوونگەرایی نوێ دەناسرێت وەڵامەکانی لە (لوتەر) وەرگرتووە[٤٥٠].

### تەوەرەی هەشتەم : کۆمەڵایەتییەکان

لە راستیدا ئەوەی ریفۆرمیستان لەمەڕ کێشە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکان گوتوویانە تەنها چەند پرسیارگەلێکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە کە لە دووتوێی گوتار و کێشە تۆیۆلوجییەکاندا

---

(٤٤٦) بیکۆن (١٥٦١-١٥٢٦ز) فەیلەسوفێکی ئینگلستانییە، رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە تێکشکاندنی رێبازی کلاسیکی پلاتۆن و ئەرستۆتالیزمی و داڕشتنی رێبازی زانستی تەجریبی. بۆ زانیاری پتر دەربارەی ژیان و کارەکانی بیکۆن بڕوانە: اميل برهييه، تاريخ الفلسفة. القرن السادس عشر، ترجمة جورج طرابيشي، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٣، ص٣١-٤٤.

(٤٤٧) دیکارت (١٥٩٦-١٦٥٠ز) یەکێك لە کاریگەرترین فەیلەسوفەکان لە دوای ئەرستۆ تالیس، بە رەچەڵەك فەرەنسی بوو و رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە بناغە داڕشتنی فەلسەفە و رێبازی زانستی نوێ و بیرکاری گرێژنەی کارەکانی بوو. بڕوانە: "الموسوعة الفلسفية المختصرة"، ترجمة فؤاد كامل و آخرون، مراجعة واشراف د. زكي نجيب محمود، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٦٣، ص١٣٨-١٤٦.

(٤٤٨) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء السادس من المجلد السادس، ص٢٦١.

(٤٤٩) جۆن ماکواری، فەلسەفەی بوونگەرایی، وەرگێڕانی ئازاد بەرزنجی، نەوا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٥٧-٥٩.

(٤٥٠) وهبة طلعت ابو العلاء، جذور إلحادية في مذاهب لاهوتية بول تلش، الكتاب الاول، الطبعة الثانية، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٧، ص٥٨.

وروژاندویانە و پتر دەچێتە خانەی هەوڵی تێکشکاندنی کۆمەڵێك بەربەستی عورفی و نەریتی و دارشتنی چوارچێوەیەکی ئایینی نویّ بۆ بەها و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی، چونکە سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوەیە بۆ خۆی وەك پێشتر باسمانکردووە لە کاتێکدا بوو کە رەوتی گەشەسەندنی ژیانی مرۆڤ وەرچەرخانێکی کۆمەڵایەتی گەورەی ئافراند بوو، بەمەش لە لایەکەوە کۆمەڵگای لە بەشێکی زۆری بەها و نەریتە کۆنەکان وەرِز کردبوو، لە لایەکی تریشەوە هەندێك بەها و ئەخلاق لە شکۆفەدا بوون، کە دەبوو لەو کاتە دا بە جۆرێك لە ویژدان سنووردار بکرێت تا لە چەشنی رەفتارێکی کۆمەڵایەتی شیاو بەو سەردەمە بەرجەستەبێت، بەڵام لە سنوورەکانی کڵێسای کاتۆلیکی و سەدە نێوەنجییەکان جیابێت[٤٥١]. چونکە جگە لەوەی کە ریشەکێشکردنی تەواوی ئەخلاقە کۆمەڵایەتییەکان لە توانای هیچ هێزێکی مێژوویدا نییە، هاوکات ئەو رەوشەی کە تامەزرۆی تروسکاییەك لە ئازادی بوو، لەگەڵ تێکشکاندنی دەسەڵات و کۆنترۆڵی کڵێسادا ئیدی بە چەشنێك لە چاو سەردەمەکەی خۆی سەرەرِۆیانە هەنگاوی دەنا، کە دواجار لە شێوەی گەندەڵی و شیرازەتێکچوونێکی کۆمەڵایەتی گەورەدا دەهاتە بەرچاو کە لە راستیدا ئەمە بەکردەوە لەبەریەکهەڵوەشانەوەی ئەخلاق و بەهاکانی سەدە نێوەنجییەکان بوو، کە لە بنەرِەتدا لێکەوتەی ریفۆرم نەبوون بەڵکو ئەنجامێك بوون بۆ گەشەسەندنی سەروەت و سامان و شێوازی نوێی ژیان کە دەمێك بوو تەواوی وڵاتە کاتۆلیکی و پرۆتێستانتییەکانی گرتبووەوە[٤٥٢]، هەر ئەمەش وایکرد کە خودی ریفۆرمیستەکان ئەم بزووتنەوەیە بەمایەی شیرازەتێکچوونی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی بزانن، بۆیە (لوتەر) بە ئاشکرا دەڵێت: "تا بەرەو پێشتر بچین دونیا ناشیرنتر دەبێت، زۆر روون دیارە کە مرۆڤ چۆن گەندەڵ و بەدرەوشت و شەرِانگێز بووە، کە گەڵێك لە سەردەمی پاپا زۆرترە"[٤٥٣]، راشکاوانە باسی ئەوە دەکات، کە خەڵکی ئەڵمانیا بوونەتە جێی تانە و توانجی گەلانی تر و مایەی شەرمەزاری و پرِ بووە لە دزی و درۆ و فرت و فێڵ، هەروەها (کالڤن)یش باس لە ترسی خۆی دەکات لە ئایندە و دەڵێت مەگەر خوا بۆ خۆی دابەزێتە سەر زەوی دەنا وەحشیگەرییەکی گەورە بەرِێوەیە[٤٥٤].

---

(٤٥١) جهينة سلطان العيسى و آخرون، المصدر السابق، ص٢٠٢.

(٤٥٢) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس، ص٢٠٧.

(٤٥٣) مقتبس في: المصدر نفسه، ص٢٠٦.

(٤٥٤) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس، ص٢٠٦-٢٠٧.

بەجۆرە بزووتنەوەی ریفۆرم وەك بزووتنەوەیەكی كۆمەڵایەتی كەوتە هەوڵی دانانی رێ و شوێنی گونجاو بۆ ئەو رەوشە نوێیە، لە لایەك بە هێور كردنەوەی بەشێكی ئەو تەوژمە بێ سەروبەرەییە كۆمەڵایەتییە و لە لایەكی تریشەوە بە تواندنەوە و شوێن كردنەوەی زۆرێك لەو بەها و ئەخلاقە نوێیانە لە بۆتەی پرەنسیپە ئایینییەكاندا، بەمەش گرێ كوێرە كۆمەڵایەتییەكانی سەدە نێوەنجییەكان دەكاتەوە، كە دواجار زەمینەسازی بۆ شێوازی نوێی بەها و ئەخلاقە كۆمەڵایەتییەكانی كۆمەڵگای سەدەكانی دواتر دەكات.

گۆڕانی چەمكی خێزان كە دواتر كۆمەڵێك گۆڕانكاری كۆمەڵایەتی گەورەی خستەوە، یەكێك بوو لە ئەنجامە كۆمەڵایەتییە گرنگەكانی ئەم بزووتنەوەیە. خێزان كە لەو رۆژگارەدا كرۆكی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان بوو و توخمی سەرەكی مانەوەی پەیوەندییە خوێنەكان (روابط الدم) بوو، ئەو پێكهاتەیە بوو، كە باوك تێیدا باڵادەستبوو و تەواوی ژیان و كار و ئارەزووەكانی منداڵ وابەستەی ئارەزووەكانی ئەو بوون و گوێڕایەڵی نەكردنی ئارەزووەكانی دەچوونە خانەی گوناهەكارییەوە [455]، بەڵام تەوژمی گۆڕانكارییەكان تادەهات ئەو تێڕوانینەی كاڵدەكردەوە و هێدی هێدی دەركەوتنی شێوازی نوێی بەرهەمهێنان و فراوانبوونی خوێندن و دووركەوتنەوە لە خێزان، لە دەسەڵاتی رەهای باوكی بەسەر ئارەزووەكانی منداڵدا كەمدەكردەوە و ئیدی سەرپێچیكردنی ئارەزووەكانی باوك رۆژ لە دوای رۆژ پەرەیدەسەند، بۆ نموومە خودی (لوتەر) بەم سەرپێچیكردنە هەنگاوەكانی دەستپێكرد كاتێك كە بێ رەزامەندی خێزانەكەی بووە راهیب [456].

رووداوەكانی ئەم بزووتنەوەیە بەوەی كە لەلایەك داڵدەگایەكی لەباری بۆ سەرپێچیكەران ئافراند و لەلایەكی تریشەوە هۆشیارییەكی ئایینیی بۆ رەخساند هێندەی تر هەنگاوەكانی ئەم دیاردە كۆمەڵایەتییەی خێراتر كرد و ئیدی منداڵەكان بەبێ ویستی خێزان تەنانەت ئایینزای ئایینیشیان هەڵدەبژارد، بەمەش رۆژ لە دوای رۆژ ئەم دیاردەیە بڵاوتر و فراوانتر دەبوو، لێرەشەوە تادەهات هەڵهاتن و دوركەوتنەوەی لاوەكان چ كوڕ چ كچ بەرەو ناوچە پرۆتێستانتییەكان پتردەبوون، ئەمەش لەپاڵ ئەوەدا كە كۆمەڵێك كێشەی كۆمەڵایەتی وەك ئاوارەیی و لادانی ئەخلاقی و هاوسەرگیری بێ رەزامەندی باوك و پەرتەوازەیی خێزان و كێشەی میرات و ... هتد، دەخستەوە، هاوكات پێدەچێت، كە دەسپێكی هەنگاوەكانی كۆمەڵگا

---

(٤٥٥) بروانە : دونالد ر.كيلي، المصدر السابق، ص٩٢-٩٤.

(٤٥٦) المصدر نفسه، ص٩٧.

بوویێت لە هەڵتەکاندنی پێکهاتە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان و گەڕان بە شوێن بناغەیەکی ئایدۆلۆجی کۆمەڵایەتی نویێ و شیاوی سەردەمەکە کە لە هۆشیارییەکی ئایینییەوە سەرچاوەی گرتبێت و گۆڕانی پەیوەندییە خزمایەتییە خوێنییەکان بوویێت بە ئایینییەکان، دواجاریش هەنگاوی یەکەمی لەبەریەکهەڵوەشانەوەی وەلا و ئەندامیەتییە خێڵەکییەکان بوویێت ئەوەش بە ئاوێتەکردنیان لە ڕێی ئایینزایەکەوە و دەرکەوتنی وەلا بۆ ئایینزاییەکی دیاریکراو و سەرەنجام زەمینەسازی بۆ دەرکەوتنی شێوازی نوێی وەلا و ئەندامیەتی کۆمەڵایەتی کردبێت(٤٥٧).

لەلایەکی تریشەوە پێشکەوتنی بەردەوامی ژیانی دونیایی و خۆشگوزەرانی، هەروەها ئەو تێکەڵبوونەی کە لە ئەنجامی شێوازی نوێی ژیان و خوێندن لە نێوان کوڕ و کچدا دەرکەوت و زۆربوونی بەردەوامی دیاردەی هاوسەرگیری بێ ڕەزامەندی باوك و فراوانبوونی ڕۆژ بە ڕۆژی لارێبوونە ئەخلاقییەکان، تادەهات کێشەکانی وەك هاوسەرگیری و مارە و جیابوونەوە و خەفەکردنی سێکسی دەکردە گرێژنەیەکی (محور) سەرەکی باسەکانی ریفۆرمیستەکان، ئیدی لەپاڵ ئەوەدا کە نیگەرانییەکی زۆریان بەرانبەر زۆرێك لەو دیاردە نوێیانە دەردەبڕی، تایبەت گەندەڵی ئەخلاقی و بەدرەوشتیکردن و دیاردەی هاوسەرگیری بێ ڕەزامەندی خێزان ، بۆ نموونە (لوتەر) زۆر بەوە نیگەران بوو، کە بیستی کوڕی (میلانگتن) بێ پرسی باوکی ژنی خواستووە و بەمایەی شەرمەزاری و سومعەتێکچوونی (ڤێتەنبرگی) دەزانێت و لە ساڵی (١٥٤٤ز)یشدا گوتارێك دژ بەم دیاردەیە بڵاودەکاتەوە، هەروەها یەکێك لە مامۆستاکانی ئەڵمانیا لەو ڕۆژگارەدا بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات، کە ڕۆژگاری ئەوان زۆر لە عورف و نەریتە کۆنەکان دوور کەوتۆتەوە و وایلێهاتووە، کە کوڕ و کچ بێ ڕەزامەندی خێزان و عورف و یاسا هاوسەرییەتی پێکەوەبنێن(٤٥٨)، هاوکات ریفۆرمیستەکان بەچاوی گومانەوە دەیانڕوانییە دیاردەی ڕەبەنی پیاوانی ئایینی و خەفەکردنی ئارەزووە سێکسییەکان کە لەسەدە نێوەنجییەکاندا تۆخمێکی سەرەکی خواپەرستی و بێگەردی ئایینی بوون، بەڵام بەلای ئەمانەوە مایەی ئەو بەدرەوشتی و گەندەڵییە ئەخلاقییە بوون، کە کڵێسای کردبووە مایەی گاڵتەجاری زۆرێك(٤٥٩).

---

(٤٥٧) دونالد ر.كيلي، المصدر السابق، ص٩٧-١٠٠.

(٤٥٨) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس، ص١٩٩-٢٠٠.

(٤٥٩) جيفري بارندر، الجنس في أديان العالم، دار الكلمة للنشر والتوزيع والطباعة، دمشق، ٢٠٠١، ص٢٨٠، ٢٩٣؛ Palmer, OP. Cit.,P.89

وێڕای ئەوەی کە ریفۆرمیستان ئەو تێگەیشتنەی کە لە سەدە نێوەنجییەکانـدا لەمـەڕ ژن و ئارەزووە سێکسییەکان و هاوسەرگیری هەبوو و بە مایەی دوورکەوتنەوە لە خواپەرستی ئەژمار دەکـران، تێکدەشـکێنن و هاوسـەرییەتی و خێـزان پێکـەوەنان بـە یـەکێك لـە بەخـشش و سونەتەکانی خوا لە قەڵەمدەدەن و پیادەکردنێکی شەرعییانەی ئارەزووە سێکسییەکان بەمافی ئاسایی مرۆڤ دەزانن. (لوتەر) سەرەڕای ئەوەی بە توندی دژ بە دیاردەی بەدڕەوشتی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووە سێکسییەکان بەئاسایی دەزانێت و ئامۆژگاری پیاوانی ئایینی دەکـات، کـە سوێند لەسەر خەفەکردنی دەروون و ئارەزووە سێکـسییەکان نـەخۆن ، هاوکـات (زوینگلـی) و (کالڤن)یش بەو پێیەی کە لە هیچ شـوێنێکی کتێبـی پـیرۆزدا قەدەغەنـەکراوە، ژنهێنـان بـە پێویست دەزانن و تەنانەت (کالڤن) پەیوەندی سێکسی شەریفانەی پیرۆز نرخاند[٤٦٠]. بـەمجۆرە جگە لەوەی کە لە وڵاتە پرۆتێستانتییەکاندا نهێنـی ژنهێنـان نـەما وەك یـەکێك لـە حـەوت نهێنییەکە، هاوسەرییەتی چەمکێکی پیرۆزی وەرگرت، هاوکات بە تێپەڕبونی کات مارەکردن و گرێبەستی هاوسەرییەتیش هێدی هێدی لە دەستی پیاوانی ئایینیدا نەدەما و دەکەوتـە دەسـت دەسەڵاتی دونیایی[٤٦١]، لەلایەکی تریشەوە کێشەی جیابوونەوە، کە لە ئایینزای کاتۆلیکییـدا بە پشت بەستن بەچەند وتەیەکی مەسـیح و چـەند دەقێکـی کتێبـی پـیرۆز بەهـەموو جۆرێـك قەدەغە بوو[٤٦٢]، بە تێپەڕبوونی کات لە وڵاتە پرۆتێـستانتییەکاندا رێپێـدراو کـرا، هـەروەها ئەگەرچی زۆرێك لە ریفۆرمیستان پێداگیرییان لەسەر یەك ژنی دەکرد، هەمانکات بە پێی چەند مەرجێك دوو ژنیشیان قەبوولکرد، وێـڕای ئـەوەی کـە هـەر زوو لەوڵاتـە پروتێـستانتییەکاندا جۆرێك لە ئازادی پەیوەندی بەستن و خۆشەویستی و یەکدی بینینی نێوان کـوڕ و کـچ بـەر لـە گواستنەوە دەرکەوت، کە تا ئێستاش لە کاتۆلیکییەکان جیایان دەکاتەوە[٤٦٣].

بەڵام سەبارەت بە پێگەی کۆمەڵایەتی ئـافرەت، ئـەوا لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم بزووتنەوەیـە ئافرەتی هێنایە کۆڕی خوێندنەوە و ژمارەیەك لە ریفۆرمیستان بانگەشەی رەفتارکردنی باشیان

---

(٤٦٠) بڕوانە: جیفری بارندر، المصدر السابق، ص٢٩٣-٢٩٤.

(٤٦١) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس ، ص٢٠٠.

(٤٦٢) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: الأدب كميل حشيمة اليسوعي، المسيحي والطلاق، دار المشرق، بيروت، د.ت.، ص٩-١٧.

(٤٦٣) جيفري بارندر، المصدر السابق، ص٢٩٤؛ ول ديورانت ، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس، ص٢٠٠-٢٠١.

دەکرد لەگەڵ ئافرەتدا و هەر لە ساڵی (١٥٢٠ز) بەدواوە لە هەندێك ناوچەی ئەڵمانیا ژنان ئەو مافەیان پێدرا، کە لە هاوسەری خراپ و بەدرەوشت جیابنەوە و ریفۆرمیستی بەناوبانگی ستراسبۆرگ (مارتن بوسەر- 1491-1551ز Martin Bucer) تارادەیەك مافەکانی ئافرەتی لە خێزاندا وروژاند و رایگەیاند، کە نابێت فەرمانبەرداری و ملکەچی ژنان بۆ پیاو ببێتە مایەی پشتگوێ خستنی تەواوی مافەکانی ژن[٤٦٤]، کەچی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەسەر پێگەی کۆمەڵایەتی ئافرەتدا نەهات ، تەواوی کایەکان و دەسەڵاتەکان هەر بۆ پیاو بوون و ئافرەت هەر سێبەری پیاو بوو و پیاو هەر دەسەڵاتی مردن و ژینی لەخێزاندا هەبوو ، ژمارەی ئافرەت لە کایە جیاجیاکانی سیاسەت و بەڕێوەبردن و مامۆستای زانکۆ و نووسەر و تیۆلۆجیناسیدا زۆر کەمبوون و بە پەنجەی دەست دەژمێردران[٤٦٥].

لەلایەکی تریشەوە سەرجەم ئەو بەها و ئەخلاقانەی کە لەباسی یەکەمی ئەم بەشەدا باسکران، جگە لەوەی کە ئەنجامێکی ئابووری گەورەیان خستەوە ، هاوکات وەرچەرخانێکی کۆمەڵایەتی گەورە بوون و رۆڵێکی گەورەیان گێڕا لەبەرجەستەکردنی فیکری بۆرجوازی و خەملینی وەك چینێکی کۆمەڵایەتی کاریگەر[٤٦٦]، ویڕای ئەوەی کە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە گورزێکی گەورەی لەپێگەی کۆمەڵایەتی و شکۆمەندی پیاوانی ئایینی وەشاند، کە تا پیرۆزی سەریدەکێشا و ئیدی هێدی هێدی جیاوازییان لەگەڵ خەڵکە گشتییەکەدا نەما[٤٦٧].

بەروویەکی تردا رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە رۆڵێکی گەورەیان گێڕا لە رەواندنەوەی دەسەڵات و کۆنترۆڵی کلێسا لە بەڕێوەبردنی ئەرکە کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزارییەکان و باڵادەستبوونی دەسەڵاتی دونیایی، لەم رووەوە هەر دوای زەوتکردنی سەروەت و سامانی کلێسا و دێرەکان و تەریك خستنیان لە بەڕێوەبردنی بوارە کۆمەڵایەتییەکان ، ئیدی پێویستی بوونی لایەنێکی تر بۆ لەئەستۆگرتنی ئەم ئەرکانە خۆی سەپاند[٤٦٨] ، ئەوەبوو بە نەمانی خێر و

---

(٤٦٤) بڕوانە. Hase and Maltby, OP.Cit., P. 269 :

(٤٦٥) دونالد ر.كيلي، المصدر السابق، ص٩٤-٩٦.

(٤٦٦) بڕوانە : جون هرمان راندال ، المصدر السابق، ص٢٤٥-٢٤٦ .لەئینگلیزییەکەیدا John herman, Randall , OP. Cit. ,PP. 159-160.

(٤٦٧) بڕوانە: ولتر لبمان ، مدخل الى علم الاخلاق، ترجمة انعام المفتي، مراجعة عبدالملك ناشف، المكتبة العصرية بالاشتراك مع مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، بيروت-نيويورك، ١٩٦٧، ص٧٧-٧٨ .

(468) Louis Gottschalk and Donald Lach , OP. Cit., P.190.

ســەدەقە و داهــاتی کڵێــسا و دێرەکــان ئــەرکی ســەروبەرکردنی هــەژاران و کەمئەنــدامان و پەککەوتووان و بەرێوەچوونی فێرگە و نەخۆشخانەکان بوونە کێشەیەکی گەورە، بۆیــە (لوتــەر) هەر زوو ئەم ئەرکەی خستە ئەستۆی دەسەڵاتە دونیاییەکان و هەر لەو نامەیدا کە ئاراســتەی میرەکانی ئەڵمانیای کرد، ئەوەی پێشنیار کردبوو، کــە فەرمانڕەوایــەتی هــەر شــارێك ئــەرکی یارمەتیدان و دەستگرتنی هەژارەکانی بگرێتەئەستۆ، دواتریش بۆ یەکەمجار لە شاری ڤێتەنبرگدا سەندوقێك لەلایەن لایەنگرانی (لوتەر)ەوە دامەزرا بــۆ چــاودێریکردنی هــەتیوان و هــەژاران و موخــەی خوێنــدنی قوتابییــە هــەژارەکان و قەرزبەخــشین بەخێزانــە نــەدارەکان، لەســاڵی (١٥٢٥ز)یشدا (لوتەر) بەفەرمی رایگەیاند، کە پێویستە سەندوقێکی گشتی بۆ یارمەتیــدانی هەژاران دامەزرێت[٤٦٩]، جگە لەوەی (لوتەر) زۆر زوو دەسەڵاتە دونیاییەکانی بەرپرس کرد لــە دامەزراندنی فێرگە و دامودەزگا کۆمەڵایەتییــەکانی تــر[٤٧٠]، ئیــدی پــێ بــە پــێ لــە وڵاتــە پرۆتێستانتییەکاندا ئەرکی چــاودێری کۆمەڵایــەتی و دامەزرانــدنی دامودەزگــا گــشتییەکان و نەخۆشخانەکان و ئەرکی ئامارکردن و یاسا و باج دانان و دادوەری دەکەوتنە ئەستۆی دەسەڵاتی دونیایی، دواتــریش هــەمان دیــاردە زۆر لەســەرەخۆتر وڵاتــە کاتۆلیکییــەکانی گرتــەوە [٤٧١]، لێرەشەوە هەنگاوەکانی دامەزراندنی دەولەتی دونیایی و موئەسەساتی بەهێز دەرکەوتن.

سەرئەنجام ئەگەرچی رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە کۆمەڵێك ئاکامی کۆمەڵایەتی خراپیــان خستەوە و لێکدانەوەکانی ریفۆرمیــستان لــەبوارە کۆمەڵایەتییەکانــدا ســنوورە ئایینییــەکانی نەبەزاندبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بزووتنەوەیە گورزێکی گەورەی لەچــەمکە کۆمەڵایەتییــەکانی سەدە نێوەنجییەکان وەشاند و رێخۆشکەری باڵادەستبوونی یاسا و رێسا کۆمەڵایەتییەکانی کــرد و دواجار کۆمەکێکی گەورەی بەپرۆسەی مێــژوویی و فراوانبــوونی دەســەڵاتەکانی کۆمــەڵگای مەدەنی کرد و وەرچەرخانێکی گەورەی بەســەر بــەها کۆمەڵایــەتی و ئەخلاقییەکانــدا هێنــا و سەرەنجام بووە ئەو رۆحە نوێیەی کە رۆڵی سەرەکی گێڕا لەسەقامگیرکردنی ســەرمایەداری وەك پێکهاتەیەکی ئابووری-کۆمەڵایەتی[٤٧٢].

---

(٤٦٩) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس، ص٢٠٤.

(٤٧٠) عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٤.

(471) Hayes and Cole, Op.Cit., P.38; Louis Gottschalk and Donald lach, Op.Cit, P.190; Herbert Heaton, Op.Cit, P. 221.

(٤٧٢) جهينة سلطان العيسى وآخرون، المصدر السابق، ص٢٠٣-٢٠٤.

**تەوەرەی نۆیەم: پەروەردە و فێربوون**

هەرچەندە سەرەتا رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە ئەنجامی خراپیان لە بواری پەروەردە و فێربووندا خستەوە، ئەوەبوو بە نەمانی چاودێری و کۆمەکی کڵێسا و دێرەکان بەشێکی زۆری فێرگە و زانکۆکان بەرەو سستبوون و داخران چوون، لەلایەکی تریشەوە رەوشی نالەبار و پڕ لە جەنگ و ئاشووب بەشێکی زۆری خوێندکارانی ناچارکرد دەست لەخوێندن هەڵگرن[٤٧٣]، ئەمە جگە لەوەی دەمارگیری ئایینی و ململانێکان کە بە قووڵایی ناخی کۆمەڵدا رۆچووبوون، فێرگە و زانکۆکانی کردبووە وێنەیەکی بچووککراوەی ئەم ململانێیە و ئەمەش بەشی زۆری کۆمەڵی لە خوێندن بێئومێد کردبوو[٤٧٤]، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەر لە سەرەتاوە ریفۆرمیستەکان لەو روانگەیەوە کە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و بەرزی ئاستی رۆشنبیری کاراتر و پشت ئەستورتریان دەکات لە رووبەڕووبوونەوەی نەیارەکانیاندا، بایەخێکی گەورەیان بەفێربوون و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری دەدا، بۆیە (لوتەر) هەر زوو بەم دۆخی کەمبوونەوەی فێرگە و قوتابییە نیگەران دەبێت و لەساڵی (١٥٢٤ز)ەوە گلەیی لە کەمتەرخەمیکردنی میر و فەرمانڕەوا دونیاییەکان دەکات لەم رووەوە داوای دامەزراندنی فێرگە و قوتابخانەی نوێیان لێدەکات[٤٧٥]. (لوتەر) هەر لەسەرەتای کارەکانییەوە هەوڵێکی زۆری دەدا لە پێناو بڵاوبوونەوەی خوێندەواری بە نێو تەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵدا و بێ جیاوازی نێر و مێ، دواتریش لە گۆتارێکدا لە ساڵی (١٥٣٠ز) بەئاشکرا بانگەشە بۆ بڵاوبوونەوەی بە ئیلزامی بوونی فێربوون دەکات و دەسەڵاتە دونیاییەکان بۆ پیادەکردنی ئەم ئەرکە هاندەدات بەوەی زۆر لە خێزانەکان بکەن، تا منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانە، جگە لەوەی (لوتەر) پیشەی مامۆستایی زۆر بە پیرۆز دەنرخاند و پێیوابوو، کە بە پارە و پول پاداشت نادرێتەوە[٤٧٦]. لە رووبەکی تریشەوە (لوتەر) هێرشێکی گەورەی کردە سەر شێوازی وانەگوتنەوە و خوێندنی سکۆلاستی سەدە نێوەنجییەکان و بە سیستەمێکی دواکەوتوو و توندوتیژی دەزانی و شێوازێکی کراوەتری

---

(473) Arthur P. Watts, OP. Cit., PP. 78-79.

(٤٧٤) عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٢؛ Arthur P.Watts,OP.Cit.,PP78-79.

(٤٧٥) سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦ ؛ Hayes and Cole, OP.Cit., P.37.

(٤٧٦) دونالد ر.کیلی، المصدر السابق، ص١٧٥؛ عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٤؛ سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦.

له خوێندن و فێربوون داهێنا و جەختیشی لەسەر گرنگی مەشقی وەرزشی و گۆرانی و مۆسیقا دەکـردەوە، دواتـریش ئـەم رێبـازەی (لوتـەر) لـە بـواری فێربـوون و پـەروەردەدا لەلایـەن (میلانگتن)ەوە پەرەی پێدرا و بەشێکی زۆری ژیانی بۆ خزمەتکردنی ئـەم بـوارە تـەرخانکرد و رۆلێکی گەورەی گێرا لە دامەزراندنی فێرگەی نـوێ و نۆژەنکردنـەوەی کۆنـەکان و کردنـەوەی چەندین قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆ لەناوچەکانی ئەڵمانیا[٤٧٧].

(زوینگلی) کە پتر بە هیومانیستەکان کاریگەر بوو لەبواری پەروەردە و فێربووندا هەوڵێکی زۆری دەدا و لەم بوارەشـدا بەرهـەمێکی بـە نـاوی "بنـەماکانی پـەروەردەکردنی منـداڵ بـە پەروەردەیەکی مەسیحی" بلاوکردەوە، کە تێیدا جـەخت لەسـەر گرنگـی فێربـوونی مێـژوو و حیساب و مەشقی سوارچاکی دەکرد، جگە لەوەی کە چەندین فێرگەی لە ناوچـەکانی سویـسرا دامەزراند[٤٧٨]، تەنانەت برێکی ئەو سامانەی لە کلێسا زەوتکرابوو بۆ دامەزراندنی زانکۆیەك تـەرخانیکرد[٤٧٩]. هـەروەها (کـالڤن)یـش لەدوادواییـەکانی تەمەنیـدا بایـەخێکی زۆری بەدامەزراندنی فێرگە و قوتابخانە دا و زانکۆیەکی لە شاری جنێڤ دامەزراند[٤٨٠].

لەلایەکی تریشەوە هەر لە چوارچێوەی خۆسـازدان بـۆ ململانـێ تیۆلۆجییـەکان، کلێـسای کاتۆلیکیش بایەخێکی گەورەی بەم بوارە دا، تایبەت دوای دەرکەوتنی بزووتنەوەی دژە ریفۆرم وەکو پێشتر باسمانکرد، جۆزیتییەکان رۆڵێکی گەورەیان گێرا لە کردنەوەی فێرگە و زانکۆکان و ئەمە جگە لەوەی زۆرێك لە گرووپە ئاینییەکانی تریش فێرگـە و زانکـۆی تایبـەت بـەخۆیان دامەزراند[٤٨١].

بەمجۆرە ئەگەرچی تەواوی ئەو کارانەی لەبواری پەروەردە و فێربووندا لە رۆژگاری ریفۆرمـدا ئەنجامدەدران بە مەبەستی خزمەتکردن بە ململانێ تیۆلۆجی و بەرژەوەندییە ئاینییەکان بوون، بەڵام دواجار بوونە بناغەی ماددی و فیکری سەدە نوێیەکان لەم بوارەدا.

---

(٤٧٧) دونالد ر. کیلی، المصدر السابق، ص١٧٥ ؛ عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٤ ؛ سـارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧.

(٤٧٨) عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٢.

(479) Arthur P.Watts, Op. Cit., P.57.

(٤٨٠) عبدالله زاهي الرشدان، المصدر السابق، ص٢٧٢.

(٤٨١) سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٧.

**تەوەرەی دەیەم: ئەدەب و هونەر**

سەبارەت بە هونەر ئەم بوارەش وەك زۆربەی کایەکانی تـر، لەسـەرەتادا رووداوەکـانی ئـەم بزووتنەوەیە پێچەوانەی هەنگاوەکانی کەوتنەوە، بەو پێیەی کە ریفۆرمیستەکان بەشێکی زۆری کایە هونەرییەکانیان بەحەرام دەزانی و ژمارەیەکیان بەتەواوی کەوتنە رەتکردنـەوەی هونـەری پەیکەرتاشی و نیگارکێشان و موزیك، لەلایەکی تریشەوە بەشی هـەرە زۆری ریفۆرمیـستەکان دژ بە دیاردەی هەبوونی ئایکۆن و تابلۆ و پەیکەر لە کڵێسا و بەکارهێنانی موزیك لە رێورەسمە ئایینییەکان بوون[٤٨٢]، جگە لەوەی کە ئەگەرچی بەر لەم بزووتنەوەیـە هونەرمەنـد تارادەیـەك سەربەست بوو لە وێناکردن لە خەیاڵەوە لە چوارچێوەی کەلتووری ئایینیدا ، بـۆ نموونـە دەکـرا وێنای خوای باوك لە وێنەی پیاوێکی نورانیدا بەرجەستەبکرێت یان وێنای (مەریـەم) لەوێنـەی دایکێکی قەشەنگدا، بەڵام بە سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوەیە و دەرکەوتنی ململانێ ئایینییەکان و قووڵبوونەوەی لە مشتومرێکی تیۆلۆجییانەدا بۆ دۆزینەوەی پێناسە راستەقینەکان بە جۆرێك کە خودی ماهیەتی خودا شایەنی پێناسەکردن بکات، ئیدی بوارێك بـۆ وێنـاکردنی خـودا لـە وێنەی پیاوێکدا ناهێڵێتەوە، بەمەش لەگەڵ پتر عەقڵانی بوونی پرەنسیپە ئایینییەکاندا بـواری وێناکردن لە خەیاڵەوە لە کەلتووره ئایینییەکانەوە بەرتەسکتر دەبوو[٤٨٣]، دواتـریش هـەر ئـەم رەوشە کڵێسای کاتۆلیکی ناچاردەکات، کە لە ئەنجوومەنی ترێنتدا بەپێی بڕیارێك هەڵواسـینی وێنە و تابلۆ بێ رەزامەندی ئیپسکۆسپی کڵێساکە قەدەغەبکات[٤٨٤].

سەرەڕای ئەمانەش رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە نەیاندەتوانی پەك بەهەنگاوەکانی هونـەر بخەن، چونکە نە (لوتەر) نە (کالڤن)یش کە کاریگەری سەرەکییان هـەبوو لـەم بزووتنەوەیـەدا، بەو پێیەی کە لە هیچ شوێنێکی کتێبی پیرۆزدا هونەر قەدەغەنەکراوە، زۆر توندڕەو نەبوون لەم بارەیەوە، ئەوەتا (لوتەر) بە راشکاوی دەڵێت : "من ناڵێم ئینجیل دەبێت سەرجەم هونـەرەکان لەناوبەرێت وەك ژمارەیەك لەو کەسانەی باوەڕیـان بەخورافەیـە، بـەڵکو بـە پێـچەوانەوە مـن ئاواتەخوازم هەموو هونەرەکان ببینم ....، کەخوا پێی بەخشیوین"[٤٨٥]. (کالڤن)یـش کـە بـە توندی دژی بت و پەیکەر بوو دەڵێت : "هێندە توندڕەو نیم کە تەواوی پەیکەرەکان حەرام بکەم

(٤٨٢) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الثالث من المجلد السادس، ص٦٣.

(٤٨٣) ولتر لبمان، المصدر السابق، ص٩٩.

(٤٨٤) المصدر نفسه، ص١٠٣.

(٤٨٥) مقتبس في: ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزءالثالث من المجلد السادس، ص٦٣ .

...، چونکە هونەری نیگارکێشان و پەیکەرتاشین ...، لای خواوە هاتوون، بۆیە من دەمەوێت پەیڕەوکردنی هونەرێکی بێگەرد و شەرعی بپارێزرێت و نابێت شتێك وێنەبکرێت یان دابتاشرێت کە بەچاو نابینرێت"[٤٨٦].

لەلایەکی تریشەوە زۆرێك لەم کایە هونەرییانە بوونە ئامرازێکی پیادەکردنی پروپاگەندە و خزمەتکردن بە ململانێی ئایینی و لێرەشەوە دەیان و سەدان تابلۆ لە چوارچێوەی داکۆکیکردن و رەخنەگرتنی یەك لە یەکدی لایەنە ناکۆکەکان دەرکەوتن، لەم بوارەشدا چەند نیگارکێشێکی پرۆتێستانتی بەناوبانگی وەك (لۆکاس کرانج - Lucas Cranach)ی هاوڕێی (لوتەر) کەچەند ساڵێك نیگارکێشی کۆشکی (فەرەدریك سەکسۆنی) بوو و وێنەی نامیلکە و کتێبەکانی (لوتەر)ی دەکێشا و چەندین وێنەشی لەخەیاڵەوە کێشابوو و (ئالبرت دۆرەر - Albert Dorar) کە بەشێکی زۆری تابلۆکانی گوزارشتیان لە کتێبی پیرۆز دەکرد، دەرکەوتن[٤٨٧]. وێڕای ئەوەی ململانێ و جەنگی ئایینی و زێدەڕۆیی نەریتە ئایینییەکان تادەهات پتر هونەرمەندانی بەو ئاقارەدا دەبرد، کە پشت بکەنە نەریتە ئایینییەکان و لە بایەخیان کەمبکەنەوە و پشتگوێیان بخەن[٤٨٨].

لەبواری هونەری بیناسازیشدا ئەم بزووتنەوەیە بە کەمکردنەوەی دامەزراندنی کڵێسا و دوورکەوتنەوە لەشێوازی ئاڵۆزی بیناسازی کڵێسای کاتۆلیکی و سادەیی بیناکانیانەوە، هەروەها بەکەمکردنەوەی داهاتی کڵێسای رۆما بە دابڕانی ناوچە پرۆتێستانتییەکان و کەمبوونەوەیەکی بەرچاوی ئەو برە داهاتەی کە پێشتر بۆ بواری بیناسازی و کایە هونەرییەکان تەرخاندەکرا، بووە رەگەزێکی سەرەکی بەهاوبەشی لەگەڵ رێنێسانسدا بۆ لەناوچوونی یەکجارەکی شێوازی بیناسازی غوتی و داهێنانی شێوازێکی نوێ لەم بوارەدا[٤٨٩].

بەڵام لەبواری موزیکدا بزووتنەوەی ریفۆرم لە سەرەتاوە بووە مایەی پێشکەوتنی ئەم بوارە هونەرییە، چونکە (لوتەر) بۆ خۆی ژەنیار بوو و ئارەزووی لە شێوازێکی موزیکی فرە دەنگ و

---

(٤٨٦) مقتبس في: المصدر نفسه، ص٦٣.

(٤٨٧) سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣-٨٤

Gerbart Hoffmeister, The Renaissance and Reformation Germany, An Introduction, Fredericls Ungar Publishing Co., New York, 1977, P.63.

(٤٨٨) ولتر لبمان، المصدرالسابق، ص٩٩.

(٤٨٩) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزءالثالث من المجلد السادس، ص٦٣-٦٤

Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 76.

تۆن بوو و هەر زوو هەوڵی پێشکەوتنی ئەم لایەنەی دا و لەساڵی (١٥٣٨ز)یشدا لە گوتارێکدا ئاماژە بەوە دەکات، کە گرنگە لاوان فێری موزیك بن وەك هونەرێکی خوایی، ساڵی (١٥٣٤ز)یش بە یارمەتی چەند هاوڕێیەکی خۆی یەکەم سروودی پرۆتێستانتی دانا و دواتریش چەندین سروودی ئایینی تری نووسی و بەناوبانگترینیان (قەڵای سەخت) بوو کە بەشێکی زۆریان بە زمانی ئەڵمانی بوون و دواتر زۆرێکیان وەرگێڕدرانە سەر زمانە میللییەکانی تر[٤٩٠]، بەمەش هونەری موزیکی لەقۆرغاری و ئاڵۆزی سەدە نێوەنجییەکان رزگارکرد، کە وەك یەکێك لە نهێنییە ئایینییەکان بوو و تەنها چەند پیاوێکی ئایینی و لە کاتی سروودە ئایینییەکاندا و بە زمانی لاتینی بەکاریان دەهێنا. لێرەوە ئیدی موزیك بە زمانی میللی و بە شێوازێکی سادە بە نێو تەواوی کۆمەڵدا بڵاوبووەوە.

لەبواری ئەدەبیشدا رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە چەند روویەکەوە کەوتنە خزمەت پێشکەوتن و فراوانبوونی بەرهەمە ئەدەبییەکانەوە، بەوەی کە لەلایەك بە تێکشکاندنی کۆنترۆلی کڵێسا، ئەدەبی لەکۆمەڵێك کۆت و بەندی عورفی و ئەخلاقی رزگارکرد، هەروەها بە ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی و رووداوەکانی وەك ئاوارەیی و غوربەت و ململانێی ئایینی و کارەساتە جەنگییەکان، بەرهەمە ئەدەبییەکانی فرەبابەت و دەوڵەمەندتر کرد، لەلایەکی تریشەوە بەو رۆڵەی کە ئەم بزووتنەوەیە لە گەشەکردن و فراوانبوونی زمانە میللییەکاندا گێڕای، کە دواجار بووە مایەی شکۆفەکردنی زمانی ئەدەبی نەتەوەیی ، بۆ نموونە ئەو زمانەی کە (لوتەر) ئینجیلی پێ نووسییەوە دواتر بووە زمانی ستانداردی نووسەر و ئەدیب و بیریارە ئەڵمانییەکان[٤٩١]، هەروەها زمانی نوسخە فەرەنسییەکەی کتێبەکەی (کالڤن) بووە گەنجینەیەکی زمانەوانی گەورە بۆ شیعر و پەخشانی فەرەنسی لە سەدەی شازدەدا[٤٩٢] لێرەشەوە ئەم بزووتنەوەیە کۆمەکێکی گەورەی بە رەوتی پێشکەوتنی بەرهەمە ئەدەبییەکان کرد، وێڕای ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە بە هاندانی خوێندن و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بووە مایەی زۆربوونی بەردەوامی خوێنەری بەرهەمە ئەدەبییەکان، ئەمەش هاندەرێکی گەورەی فراوانبوونی ئەو بەرهەمانە بوو[٤٩٣].

---

(٤٩٠) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الخامس من المجلد السادس، ص٢٣٠ ؛ سارا فلۆوەرز، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦ ؛ Arthur P. Watts, Op. Cit., P. 76.

(491) Louis Cottschalk and Donald Lach,OP.Cit.,P.195.

(٤٩٢) جورج طرابيشي، المصدرالسابق، ص٤٧٢.

(493) Gerbort Hoffmeister, Op. Cit., P.143.

## تەوەرەی یازدەهەم: کاریگەری ئەنجامەکانی بزووتنەوەی ریفۆرم لەسەر ئەمەریکا

ناوچە تازە دۆزراوەکانی ئەمەریکا کە لە سەروبەندی رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیەدا جێی چاوتێبڕینی بەشێکی زۆری خەڵکی ئەوروپا بوو، هەر زوو سەرنجی پرۆتێستانتی و رەوتە ئایینییە یاخییەکانی راکێشا، جا ئەگەر بەمەبەستی هەڵپەی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بوویێت، یان لە پێناو قوتاربوون لە زەبر و زەنگی دەسەڵاتدارییەتی ناوچەکانیان، خەڵکێکی زۆری ناوچەکانی هۆڵەندا و سکۆتلاند و سویسرا و ئەڵمانیا، دواتریش ژمارەیەکی زۆر لە پیوریتانەکانی ئینگلستان، تایبەت دوای توندبوونی ناکۆکییەکانیان لەگەڵ دەسەڵاتدا روویانکردە ئەو ناوچانە و هەر زوو لە بەشی زۆری ئەو ناوچانەدا لەرووی ئایینییەوە بوونە زۆرینە و لە سەرەتای سەدەی حەڤدەدا دەوروبەری حەفتا و پێنج لە سەدی دانیشتووانی ئەو ناوچانە لە رەوتە ناکاتۆلیکییەکان بوون[494] بۆ نموونە ساڵی (١٦٧٦ز) نزیکەی سێ بەشی دانیشتووانی شاری ماریلاند Maryland ( پروتێستانتی، یان یەکێك لەگرووپە ئایینییەکانی تر بوون و بەشەکەی تریشی کاتۆلیکی، ئەم رەوشەش جگە لەوەی کە دواجار پێکهاتەی ئایینی لە ئەمەریکا رەنگرێژکرد و بوو بە وڵاتێکی فرەئایین، دواجاریش زۆرێك لەو رووداوانەی کە ئەم بزووتنەوەیە لە ئەوروپا خستییەوە لە ستەمکاری ئایینی و لێبوردەیی ئایینی ئەم ناوچانەشی گرتەوە[495]، هاوکات زۆرێك لەو ئەنجامە ئابووری و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییانەشی لێکەوتەوە، کە لە ئەوروپا ئەم بزووتنەوەیە خستبوونیەوە.

---

(494) Will Heberg, Protestant-Catholic-Jew. An Essay in American Religious Sociology, INC, Garden City and New York, 1960, PP.6-7.

(495) John Spencer Bassett, A History of The United States (1492-1938), 3rd Edition,The Macmillan Company, New York,1941, P.148 ; R.C.Simmons, The American Colonies. From Settlement to Independence, WW – Nortonon and Company, New York and London, 1981, P.92.

## باسی سێیەم:

## ئەنجامە سیاسییەکان

کڵێسای کاتۆلیکی بەو بیانویەی کە پاپاکانی نوێنەری خودا و جێگرەوەی مەسیحن لەسەر زەوی، بە درێژایی سەدە نێوەنجییەکان خۆیان بە سەرچاوەی دەسەڵاتی دونیایی دەزانی و ئەو پیوەندییە ڕۆحییە بوو، کە تەواوی دانیشتووانی کۆمەڵگای جیهانی کاتۆلیکی پێکەوە دەبەست و هەر لەم سۆنگەیەشەوە خۆی بە بەرپرسی ڕەوشی سیاسیی دەزانی و کێشەکانی بیری سیاسیش بەشێکی دانەبڕاو دەبوون لەکارە تیۆلۆجییەکانی ئەم ئایینزایە، بۆیە سەرەنجام هەر هێرشێك بۆسەر کڵێسای کاتۆلیکی و فیکری سەدە نێوەنجییەکان دواجار دەبوو کۆمەڵێك ئەنجام و لێکەوتە لەڕووی سیاسیی و بیری سیاسییەوە بە دوای خۆیدا بێنێت[٤٩٦].

دەرکەوتنی بزووتنەوەی ریفۆرمیش وەك هێرشێك بۆ سەر دەسەڵاتی کڵێسا لە ڕۆژگارێکدا کە سەرەتای وەرچەرخانێکی سیاسیی لە ئارادابوو بەرەو پێکهێنانی قەوارە سیاسییە نوێیەکان کە لە دەوڵەتی پاشایەتی ناوەندیدا خۆی دەبینییەوە، ڕاستەوخۆ دژی دەسەڵاتی گشتگیری کڵێسای دەکەوتەوە و ئیدی تێکهەڵکێشییەکی ئەوتۆ لەنێوان ڕەهەندە سیاسییەکانی ئەم بزووتنەوەیە و هەنگاوەکانی ئەو قەوارە نوێیەدا دەردەکەوتن، کە بەشی هەرە گەورەی ڕووداوە سیاسییەکانی ئەو مەودا مێژووییە چەندە ڕووداو و لێکەوتەی ریفۆرمی ئایینی دەبوون، هێندەش گوزارشتیان لە بەرژەوەندی ئەم قەوارەیە دەکرد، بۆیە ڕووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە جگە لەوەی بوون بە توخمێکی یاریدەدەر لە ململانێی نێوان بەرژەوەندی ئەو قەوارانە، لە هەمانکاتدا خزمەتێکی گەورەی بە خەمڵینی فۆرمی کۆتایی ئەو قەوارە سیاسییە نوێیانە کرد، کە خۆی لە دەوڵەتی پاشایەتی ڕەهادا دەبینییەوە.

---

(496) G.C. Field, Political Theory, Methuen and Co. LTD, London, 1969, P. 27.

## تەوەرەی یەکەم : ململانێی سیاسیی و جەنگە ئاینییەکان

سەبارەت بە ئاشووب و کێشە سیاسییەکان، ئەم بزووتنەوەیە بەوەی کە قەوارە سیاسییەکانی بەسەر کاتۆلیك و پرۆتێستانتدا دابەشکرد لەو رۆژگارەدا کە تادەهات ململانێی نێوان فەرەنسا و ئینگلستان و ئیسپانیا توندوتیژتر دەبوو، راستەوخۆ کەوتە خزمەتی ئەو ململانێیە بەوەی کە پاساو و بیانوی ئایینی و دواجاریش خرۆشانی ئایینی بۆ ئەم کێشەیە پەیدا کرد و هەر لێرەشەوە ئەم ئایینزایانە لە چەشنی ئایدۆلۆجیایەك بۆ ئەو ولاتانە دەرکەوتن و تەواوی پەیوەندییە سیاسییە دەرەکی و کێشە سیاسییە ناوخۆییەکانیان کۆنترۆڵ کرد، لەلایەکی تریشەوە رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە زەمینەسازییان بۆ دەرکەوتنی چەند هێزێکی سیاسیی نوێ کرد لەو ناوچانەدا کە تا ئەو کاتە رۆڵێکی سیاسیی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام لێرەوە بوون بە لایەنی سەرەکی کێشە و ململانێ سیاسییەکان، لەوانە دانیمارك و سوید و بۆهیمیا و ... هتد[٤٩٧].

وێڕای ئەوەی بە دەرکەوتنی کێشەی کەمینەی ئایینی کە ئەنجامێکی ئەم بزووتنەوەیە بوو، هەلی دەستێوەردانی هێزە سیاسییەکان لە کاروباری ناوخۆی یەکدی و قۆستنەوەی لە خزمەت ئەم ململانێیە دەرکەوت[٤٩٨]، وەك ئەو پشتگیرییەی کە هەریەك لە پاشاکانی فەرەنسا و پاشاکانی ئینگلستان لە چوارچێوەی ململانێکانیان لەگەڵ ئیمپراتۆردا بە پرۆتێستانتییەکانی ئەڵمانیا کردیان[٤٩٩] یان دەستێوەردانی هەر یەك لە ئینگلستان و ئیسپانیا لە کێشەی ئایینی لە فەرەنسا[٥٠٠]. لەلایەکی تریشەوە هەر ئەم دابەشبوونە بەسەر کاتۆلیکی و پرۆتێستانتیدا رێخۆشکەری دەرکەوتنی هاوپەیمانییەتی سیاسیی و سەربازی کرد و ئیدی چەندین هاوپەیمانییەتی دەرکەوتن، کە جگە لەوانی پێشتر دیارترینیان ئەوەبوو کە ساڵی (١٦٠٨ز) لەنێوان میرە پرۆتێستانتەکاندا بەسەرۆکایەتی (فرەدریکی پێنجەم) میری ناوچەی پلاتین (Platine) دا بەسترا، دواتریش ساڵی (١٠٦٩ز) کۆمەڵەی کاتۆلیکی لەژێر سایەی (باڤاریا - Bavaria) بەسترا،[٥٠١] کە

---

(٤٩٧) ج.م.روبرتس، المصدرالسابق، ص٥٨١ — ٥٨٣ ؛F.Guizot. Op. Cit., P. 216,

(٤٩٨) بطرس بطرس غالي ومحمود خيري عيسى، المدخل في العلم السياسة، دارالطباعة الحديثة - مكتبة الأنجلو المصرية، القاهرة، ١٩٥٩، ص٢٢٧.

(٤٩٩) بڕوانە باسی سێیەم لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆلینەوەیە .

(500) "The New Encyclopedia Britannica", Vo1.15, P. 533.

(501) Edward Raymond Turner, Op. Cit., P. 228.

دواجار ئەم رەوشە بووە فاکتەرێکی کەوتنەوەی جەنگی سی ساڵە.[٥٠٢] بەمەش لەو رۆژگارەدا بەجۆرێك رووداوە سیاسیی و ئایینییەکان تێکهەڵکێش بوون، کە جیاکردنەوەی وەك جیاکردنەوەی رۆح بوو لەجەستە.[٥٠٣]

بەمجۆرەش شانبەشان قووڵبوونەوەی ململانێکان، کێشە و ناکۆکییە ئایینییەکان قووڵتر دەبوون و پتر رووداوە سیاسییەکانیانی رەنگڕێژدەکرد و جەنگ و ئاشووبەکانیان فراوانتر دەبوون، تا دواجار لە بۆتەی جەنگێکی گشتگیر و درێژخایەندا دەرکەوت، کە بەشێکی زۆری وڵاتانی ئەو کاتەی ناوچەکەی تێوەگلا و لە مێژووی ئەورووپادا بە جەنگی سی ساڵە ناسراوە. ئەم جەنگە پتر وەك دەرەنجامێك بۆ شکستی ئاشتینامەی ئۆگسبرگی ساڵی (١٥٥٥ز) لە هێورکردنەوەی رەوشە ئایینییەکە کەوتەوە، بەوەی تەنها دانی بە مافی لوتەرییەکان دانا و سەرجەم گرووپەکانی تری پشتگوێ خست، تایبەت کالڤنییەکان کە لە ناوچەکانی ئەڵمانیا و سویسرا لە زۆربوونی بەردەوامدابوون،[٥٠٤] هەروەها دواتریش بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەکانیش رۆڵێکی گەورەیان لە بەرێوەچوونی رووداوەکانیدا گێڕا هەروەك مێژوونووسی بەناوبانگ (فشەر) باسیکردووە کە هەرچەندە سوید بۆ بەرگریکردن لە پرۆتێستانتییەت کەوتە جەنگەوە، هاوکات مەیلێکی زۆری لە کۆنترۆڵکردنی سیاسیی و بازرگانی کەنارەکانی باشووری بەڵتیکدا هەبوو،[٥٠٥] جگە لەوەی بەشداری فەرەنسا لەپاڵ پرۆتێستانتییەکاندا دژ بە ئیمپراتۆر

لەم جەنگەدا جگە لە هەوڵی سنووردارکردنی دەسەڵاتی بنەماڵەی (هپسبرگ) و بەدەستهێنانی ناوچەی ئەلزاس هیچی تر نەبوو،[٥٠٦] چونکە پاشاکانی فەرەنسا بۆ خۆیان هێندە لە پاپا و ئیمپراتۆر میانڕەوتر نەبوون بەرانبەر پرۆتێستانتییەکانی وڵاتی خۆیان، بەمەش بە تێپەربوونی کات ئەم جەنگە مۆرکی ئایینی خۆی لە دەست دا و لەگەڵ کۆتاییهاتنیدا لەساڵی (١٦٤٨ز) بەپێی پەیماننامەی

---

(٥٠٢) ئەم جەنگە لەساڵی (١٦١٨ز) دا لە کێشەیەکی نێوان ئیمپراتۆریا و بۆهیمیاوە دەستیپێکرد و رووداوەکانی بە پچرپچری تا ساڵی (١٦٤٨ز)ی خایاند، ساڵی (١٦٢٥ تا ١٦٢٩ز) دانیمارکیش خزیە نێو شەڕەکەوە و دوای ئەمیش لەساڵی (١٦٣٠ز)دا سویدیشی تێوەگلا و دواجاریش لەساڵی (١٦٣٥ز)ەوە ریشیلو کە ئەوکات سەرۆك وەزیران بوو شەڕی لە دژی بنەماڵەی هپسبرگ و ئیسپانیا راگەیاند. بۆدرێژەی پتر لەم بارەیەوە بڕوانە Hayes and Cole, OP. Cit., PP. 49-103. :

(٥٠٣) دونالد ر. کیلي، المصدرالسابق، ص٥٥.

(504) V.H.H. Green, Op. Cit., P. 293.

(٥٠٥) هیربرت فیشر، أصول التاريخ الأوربي الحديث ...، ص٢٣٧. لە ئینگلیزییەکەیدا.P. 613

(506) Hayes and Cole, Op. Cit., P. 101.

ویستیڤالیا، کۆتایی بە کۆنترۆڵی ئایین هێنـا بەسـەر سیاسـەتی دەرەکـی و نـاوخۆی و ئایینییـەتی مۆرکی وڵاتانی کاڵکردەوە.(٥٠٧)

بەمجۆرە ئەم بزووتنەوەیە بووە مایەی سەرەوخونکردنی ئەو فۆرمە سیاسییە گشتگیرەی کڵێـسا و دواتریش ئیمپراتۆریای رۆمانی پـیرۆز و تێکـشکاندنی پاشماوەکـانی یـەکێتی ناوچـەکانی جیهـانی کاتۆلیکی لە ژێر سایەی یەك ئایینزادا(٥٠٨) و رۆڵێکی گەورەشی گێڕا لە ئافراندنی شـێواز و فـۆرمی سیاسیی نوێدا.

**تەوەرەی دووەم: بیری سیاسیی**

کارەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی لە بواری بیری سیاسیدا ئەگەرچی وەك بیریاری سیاسـیی گەورە (جۆرج سـاباین) دەڵێـت: لەجەوهـەردا نوێگەرییـەکی وای نـەکردووە لەچـاو ئـەوانی سـەدە نێوەنجییەکان و لەگەڵ کڵێسای کاتۆلیکیدا هاوسەرچاوە بوون، کە کەلتووری مەسیحییە و هـەموان هەر مەیدانەکان بە مەیدانی خودا دەزانن و هـەر ئـەمیش بـە ئافرێنـەری دەسـەڵاتە سیاسـییەکان دەزانن،(٥٠٩) بەمەش جارێکی تر ئەم بزووتنەوەیە کێشەکانـی بیری سیاسـیی ئاوێتـەی تیۆلۆجیـا دەکـاتـەوە و پێچەوانـەی ئاراستە ناائایینییەکـەی (رێنێسانس) و (مـاکیاڤیلی)(٥١٠) دەکـەوێتەوە

---

(507) F.Guizot, Op. Cit., P. 215.

(٥٠٨) جون باول، الفكر السياسي الغربي، ترجمة محمد رشاد خميس، مراجعة د.راشد البداوي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٨٥، ص٣٠٣ ؛ مسلم حسن محمد عزيز المظفري، الفلسفة السياسة عند هوبز، رسالة ماجستر، كلية الأداب،جامعة بغداد، نيسان ٢٠٠٤، ص٣٠.

(٥٠٩) جورج ساباين، تطورالفكر السياسي، الكتاب الثالث، ترجمة د.راشد البداوي، تقديم احمد سويلم العمري، دار المعارف بالأشتراك مع مؤسسة فرانكلين، القاهرة، ١٩٧١، ص٤٩٨. لە ئینگلیزییەکەیدا:
George H.Sabine, A History of Political Theory, 4th Edition, Dryden Prees, Tokyo, 1981, PP. 332-333.

(٥١٠) بیرناردۆ ماکیاڤیلی (١٤٦٩-١٥٢٧) مێژوونووس و بیریاری سیاسی سەردەمی رێنێسانس لەئیتالیا، بە رەچەڵەك خەڵکی شاری فلۆرەنسابوو و چەندین پلە و پۆستی سیاسی لەلایەن حکومەتی ئەم شارەوە پێ سپێردرا، کتێبی "میر" یەکێکە لە بەرهەمە گرنگەکانی ماکیاڤیلی کە تێیدا سەرجەم بیروڕا سیاسییەکانی خستۆتەڕوو، وێڕای چەندین بەرهەمی ئەدەبی و مێژوویی تر کە "هونەری جەنگ" و "مێژووی فلۆرەنسا" دیارترینیان بوون. بڕوانە : كمال مظهر، ميكافيلي والميكافيلية، دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد، ١٩٨٤، ص١٢٢- ١٣٢.

لـەم رووەوە،[٥١١] بەڵام دواجار بە ناچـاری بەهـەمان ئـەو ئاقارانـەدا دەچـێتەوە کـە (ماکیـاڤیلی) ورووژاندبووی لەداواکاری جیابوونەوەی دەسەڵاتی دونیایی لە ئاینی و پێکـەوەنانی دەوڵـەت بەهـەر نرخێك بێت، کە ببوونە ئاراستەی گـشتی کۆمـەڵگا و هـیچ بزووتنەوەیـەکی کۆمەڵایـەتی توانـای رووبەڕووبوونەوەیانی نەبوو.[٥١٢]

بۆیە هەر زوو کارەکانی (لوتەر) بە هێرش بۆسەر دەسەڵاتی دونیایی پاپا دەسـتیپێکرد و کەوتـە هەوڵی جیاکردنەوەی دەسەڵاتی دونیایی لە ئایینی، بۆیە فەیلەسووفی بەناوبانگی فەڕەنسی (ڤۆلتێر) پێیوابوو کە (لوتەر) مولحید نەبووە، بەلکو عیلمانییەك بـووە و هـەوڵی داوە کلێـسا لـە دەسـەڵاتە دونیایی و سیاسـییەکان دامالێـت.[٥١٣] دواتـریش رووداوەکـانی ئـەم بزووتنەوەیـە وەك پێـشتریش روونبۆتەوە و لە درێژەی ئەم باسەشدا پتر روونەبێتەوە بە تەواوی خزمـەت بـەم دیاردەیـە دەکـەن و سەرەنجامیش پێکەوەنانی دەوڵەت بەهەر نرخێك بێت دەکەنە پێویستییەکی مێژوویی سـەردەمەکە، بۆیە لەخۆڕا نییە بیریاری سیاسیی گەورە (هارۆلد لاسـکی) کـە باسـی سـیادەی دەوڵـەت دەکـات دەڵێت: "... دەوڵەت لە شێوەی دەزگایەکی خاوەن سـیادە ئـەنجامی زنجیرەیـەکی دوور و درێـژە لـە هەلومەرجی مێژوویی کە گرینگترینیان لەسەردەمی ریفۆرمـدا بـووە"،[٥١٤] دواتـریش لـە درێـژەی باسەکەیدا ئەوە روونەدەکاتـەوە، کـە رووداوەکـانی ئـەو رۆژگـارە بـە تـەواوی بـوونی ئـەم دەزگایـە دەسەپێنن، بەو پێیەی کە لە سەرجەم دەزگاکانی تـر کـاراتر بـوو لـە دەسـتەبەرکردنی ویـستەکانی کۆمەڵ.[٥١٥]

وێڕای ئەوەش لەگەڵ رووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیەدا کۆمەڵێك بیرۆکەی سیاسیی چەکەرەیانکرد، کە دواجار گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکان دەیانسەپاندن، لەوانە بیرۆکەی دیموکراسی کـە ژمارەیـەك لە بیریارە سیاسییەکان پێیانوایە لەگەڵ رووداوەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینیدا چەکەرەیکردووە، بەو پێیەی کە ئەم بزووتنەوەیە ئازادی و رێزی تاکەکانی ورووژاندوە و گەشـەی بـە تاکگـەرایی داوە و

---

(٥١١) عبدالكريم احمد، دراسات في النظرية السياسة الحديثة، معهد البحوث والدراسات العربية،بيروت، ١٩٧٣، ص٦٧ ؛ مسلم حسن محمد عزيز المظفري، المصدر السابق، ص٣٠.

(٥١٢) عبدالكريم احمد، دراسات ....، ص٦٨.

(٥١٣) شبلي العيسمي، العلمانية والدولة الدينية، وزارة الثقافة والأعلام، بغداد، ١٩٨٦، ص٢٢.

(٥١٤) هارولد لاسكی، مدخل الى علم السياسة، ترجمة عزالدين محمد حسين، مراجعة علي ادهم، دار الحمامي للطباعة، القاهرة، ١٩٦٥، ص١٥-١٦.

(٥١٥) المصدر نفسه، ص١٦.

تاکی وەك کەسێکی سەربەخۆ لـە کۆمەڵـدا زانیـوە، وێـڕای ئـەوەی هـەر لەگـەڵ ئەمانەشـدا ئـەو پاشەکشەکردنە بەردەوامەی باوەڕە عەقیدەییەکان بەرانبەر عەقڵ دواجار لیبرالییەتی لێکەوتەوە ئەو ڕەوتـەی کـە خوازیـاری هەرچـی زۆرتـری ئـازادی تاکەکانـە لـە کۆمەڵـدا لـە ژێـر سـایەی یاسـا مەدەنییەکاندا، کە هەموو ئەمانە بەشێکن لە تۆخمەکانی دیموکراسی،[516] ئەمە جگـە لـەوەی کـە چـەند گرووپێـك لـە ڕەوتـە ئایینییـە رادیکالـەکان لـەڕێی هەڵبژاردنـەوە پیـاوانی ئایینییـان دیاریدەکرد.[517] لەلایەکی تریشەوە کەوتنەوەی ڕەوشی دەمارگیری و ستەمکاری ئایینی کـە بەشـی هەرە زۆریان لەلایەن دەسـەڵاتی سیاسـییەوە بەڕێوەدەچـوون و دەرکـەوتنی کەمینـە ئایینییـەکان، وایکـرد کـە هـەر گرووپێکـی ئـایینی لەسـۆنگەی بەرژەوەندییـە سیاسـییەکانی خۆیـەوە پاسـاوە سیاسییەکان بێنێتـەوە، ئیـدی لای سـتەملێکراوەکان بیرۆکـەی گـەل سەرچـاوەی دەسـەڵاتەکانە و بیرۆکەی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵات کـە هەنـدێك جـار تـا ڕەتکردنـەوەی سـەرجەم دەسـەڵاتەکان سـەریدەکێـشا [518]چـەکەرەیاندەکرد،[519] کـە هـەر لـەم سۆنگەیەشـەوە بـوو (کـالڤن) سـەرەڕای بەرگریکردنی توندی لەبیرۆکەی گوێڕایەڵی کوێرانەی دەسـەڵات، بـۆ بـەرگریکردن لەلایـەنگرانی لـە فەرەنسا و سکۆتلاند و هتد، بەرەنگاربوونەوەیـەکی سـنووردار لـە دژی دەسـەڵاتدارێکی گەنـدەڵ و ناپاك ڕێپێدراو دەکات، بەمەرجێك پیاوە گەورە و خاوەن پێگە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجامیبـدەن نـەك کۆمەلانی خەڵك.[520]

هاوکات هەر ڕەوشی کەمینەی ئـایینی و سـتەمکاری کێـشەی بەرەنگاربوونـەوەی دەسـەڵاتی سیاسیی و گوێڕایەڵیکردنی کوێرانەی، دەکەنە گرێژنەیەکی سەرەکی کێشەکانی بـیری سیاسـیی لـەو

---

(516) ثروت البدوي، النظم السياسة. تطور الفكر السياسي والنظرية العامة للنظم السياسية، الكتاب الاول، دار النهضة العربية، بيروت، 1961، ص261-262؛ بطرس بطرس غالي ومحمود خيري عيسى، المصدر السابق، ص228؛ جهينة سلطان العيسى وآخرون، المصدر السابق، ص 203.

Hayes and Cole, Op. Cit., P. 37. (4)

(517) بۆ نموونە ئەناباپتیستەکان. بڕوانە باسی چوارەم لەبەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا.

(518) بطرس بطرس غالي و محمود خيري عيسى، المصدر السابق، ص227 ؛ عبدالكريم احمد، دراسات ...، ص67.

(519) فؤاد محمد شبل، الفكر السياسي. دراسات مقارنة للمذاهب السياسية والأجتماعية، الجزء الأول، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، 1974، ص259؛ عبدالجبار عبد مصطفى، المصدر السابق، ص65.

(520) جورج سابابن، المصدر السابق، ص497-498، لە ئینگلیزییەکەدا:

George H. Sabine, Op. Cit., P.335; G. C. Field, Op. Cit., P. 30.

رۆژگارەدا کە دواجار هەلومەرجە مێژووییەکە بە تەواوی دەکەوێتە خزمەت سەرکەوتنی زاڵبوونی بیرۆکەی گوێڕایەڵی کوێرانەی دەسەڵاتی سیاسیی و بیروڕای ریفۆرمیستان و رووداوەکانی ئەو بزووتنەوەیەش رۆڵی سەرەکی تێیدا دەگێڕن.[٥٢١]

ریفۆرمیستان جگە لەوەی سەرچاوەکانیان کە کەلتوورێکی ئایینی بوو پتر لەم گوێڕایەڵییەوە نزیك بوو، هاوکات ئەم بیرۆکەیە خزمەتێکی گەورەی بە بەرژەوەندییەکانیان دەکرد، بۆ نموونە (لوتەر) وەك باسمانکردووە بەتەواوی پشتی بەهێزی هەندێك لە میرەکانی ئەڵمانیا دەبەست، بۆیە راشکاوانە جەخت لەسەر خواییەتی دەسەڵاتە دونیاییەکان دەکات و بەیەکێك لەبەخششە مەزنەکانی خودا بۆ پاراستنی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی ژیانی ئاشتیانە و ئازادی کۆمەڵ لە قەڵەمیدەدات و بە نوێنەر و نمایندەی خوایان دەزانێت لەسەر زەوی،[٥٢٢] بۆیە هەموو جۆرە یاخیبوون و راپەڕینێك لە هەر بارودۆخێکدا و بە هەر بیانویەك لە دژی ئەم دەسەڵاتە دونیاییانە رەتدەکاتەوە و بە سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی خودا لە قەڵەمیدەدات[٥٢٣] و راشکاوانە دەڵێت: "هەرکەسێك خۆی بەمەسیحی بزانێت دژ بە حکوومەتە دونیاییەکەی خۆی راناپەڕێت، ئەگەر دادپەروەر بێت یان ستەمکار".[٥٢٤] هەروەها (کالڤن)یش بەمەبەستی سەپاندنی دەسەڵاتێکی رەها بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا هەمان هەڵوێستی (لوتەر)ی دەبێت لەم بارەیەوە، ئەمیش گوێڕایەڵی کوێرانەی

---

(٥٢١) مصطفى البارودي، لمحات من الفكر السياسي. حول الفرد والدولة، مطبعة الجامعة السورية، دمشق، ١٩٥٨، ص١٣٨:

W.D.J Cargill Thompson, Martin Luther and The Two Kkingdoms, "Political Ideas", Penguin Books, 1970, P.43; Elizabeth Rawson ,The Spartan Tradition in European Thought,Clarendon Press,Oxford, 1969, P.158; Kathrine Lach, Op. Cit., P.26.

(٥٢٢) محمد طه بدوي، مقاومة الحكومات الجائرة في المسيحية والاسلام في فلسفة سياسية والقانون الوضعي، دار الكتاب العربي بمصر، القاهرة، د.ت.، ص١٨؛ بطرس بطرس غالي ومحمود خيري عيسى، المصدر السابق، ص٢٣٠.

(٥٢٣) مقتبس في: جون هرمان راندل، المصدر السابق، ص٢٧٦، لە ئینگلیزییەکەدا:

John Herman Randall, Op. Cit., P.182

(٥٢٤) محمد طه بدوي، مقاومة الحكومات الجائرة ...، ص١٨؛ Phyllis Doyle, A History of Political Thought, London, 1963, PP.141-142

دەسەڵاتی دونیایی بە ئەرکێکی ئایینی دەزانێت و هەر بەگژداچوونەوەیەکی ئەم دەسەڵاتانە بە یاخیبوون لە فەرمانەکانی خوا ئەژماردەکات.[٥٢٥]

ئەمانە لەو کاتەدا بوون، کە گۆڕانکارییەکان دەمێك بوو بەرژەوەندی بەشی زۆری کۆمەڵی بە دەرکەوتنی دەوڵەتێکی ناوەندی و پاشایەکی بەهێزەوە گرێدابوو،[٥٢٦] جگە لەوەی کە لەگەڵ تیژتر بوونی ئاشووبە و جەنگەکانی ئەم بزووتنەوەیەدا تادەهات پاشاکان پتر وەك سیمبولی پاراستنی یەکێتی وڵات و دابینکەری ئاشتی دەردەکەوتن و ویستە کۆمەڵایەتییەکان وابەستەی بەهێزبوونیان دەبوون،[٥٢٧] تەنانەت لە خودی وڵاتە کاتۆلیکییەکانیشدا، وەك پێشتر باسکراوە، کە چۆن ململانێی ئایینی ترسێکی گەورەی لەسەر یەکێتی فەڕەنسا دروستکرد و پێویستی هەبوونی پاشایەکی بەهێزی سەپاند.[٥٢٨] دواتریش هەر ئەم ڕەوشە لە بۆچوونی زۆرێك لە فەیلەسووف و بیریارە سیاسییەکانی سەدەی شازدە و حەڤدەدا ڕەنگیدایەوە و بۆ زاڵبوون بە سەر ململانێی ئایینیدا، بیرۆکەی دەرکەوتنی پاشایەکی خاوەن دەسەڵاتی ڕەها بەسەر تەواوی لایەنە ئایینی و دونیاییەکاندا لە بۆتەی بیرۆکە و تێڕوانینەکانیان لە مەڕ بیری سیاسیی دەخەنەڕوو کە دیارترینیان (جان بۆدان) و (تۆماس هۆبس)[٥٢٩] بوون.[٥٣٠]

سەرەنجام ڕووداوەکانی ئەم بزووتنەوەیە گورزێکی کوشندەبوون بەر چەمکی دەسەڵاتی باڵا لە سەدە نێوەنجییەکان کەوتن و بوونە مایەی تێکشکاندنی یەکجارەکی ئەو تێگەیشتنەی کە پێیوابوو پیاوانی ئایینی نوێنەری خوان لەسەر زەوی و دەسەڵاتە دونیاییەکان لەمانەوە سەرچاوە دەگرن و شکۆفەکردنی ئەو چەمکەی کە پاشا و دەسەڵاتە دونیاییەکان جێگرەوە و نماینەدەی خودان لەسەر

---

(٥٢٥) لەم بارەیەوە بڕوانە باسی چوارەمی بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

(٥٢٦) محمد فؤاد شبل، المصدر السابق، ص ٣٥٦ ؛ عبدالكريم احمد، دراسات ....، ص٧٠.

(٥٢٧) بڕوانە باسی سێیەم، تەوەری بڵاوبوونەوەی ریفۆرم لە فەڕەنسا لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا.

(٥٢٨) بۆدان (١٥٣٠-١٥٩٦ز) فەیلەسووف و بیریاری سیاسیی ئابووری فەڕەنسی ساڵی (١٥٧٦ز) شەش کتێبەکەی دەربارەی کۆمار (Six Books of Republic) نووسی و تێیدا بیروڕا سیاسییەکانی و ڕای خۆی سەبارەت بە سیادەی سیاسیی ڕوونکردەوە. بڕوانە: "Encyclopedia International", Vol. 3, P. 93

(٥٢٩) هۆبس (١٥٨٨-١٦٧٩ز) ئەو فەیلەسووفە ئینگلیزییە بوو کە پێیوابوو دەسەڵاتێکی پاشایەتی ڕەها دەتوانێت یاسای کۆمەڵایەتی و ئاشتی بۆ کۆمەڵ دەستەبەربکات دوای ئەو جەنگە ئایینییە دوور و درێژەی کە هەر یەك لە کۆمەڵگای فەڕەنسی و ئینگلیزی بە خۆیەوە بینیویەتی. بڕوانە: جورج طرابيشي، المصدر السابق، ص٦٥٣-٦٥٤.

(٥٣٠) مصطفى البارودي، المصدر السابق، ص١٤٠.

زەوی و راستەوخۆ دەسەلاتیان لە خوداوە وەرگرتووە، لێرەشەوە بوارەکانی پیادەکردنی دەسەلاتێکی خوایی تەواو لەبەردەم کەسایەتی و گرووپە ئایینییەکاندا بەرتەسك و کەم مەودا کرد و هاوکات رۆڵێکی سەرەکی لە سەرهەڵدانی بیرۆکەی "مافی خوایەتی دەسەلاتی پاشا" گێڕا کە دواتر بۆ چەند سەدەیەك فۆرمی دەسەلاتی سیاسیی لە ئەورووپا رەنگرێژکرد.(٥٣١)

**تەوەرەی سێیەم: ریفۆرم و ناسیۆنالیزم**

یەکێکی تر لە ئەنجامەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بریتیبوو لەوەی کە زۆرێك لە هەنگاوەکانی ئەم بزووتنەوەیە زەمینەسازییان بۆ دەرکەوتنی گەلێك لە سیما و خەسڵەتە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانی سەردەمی ناسیۆنالیزم کرد، ئەم بزووتنەوەیە لە پاڵ ئەوەدا کە بە تێکشکاندنی چەمکی گشتگیری کڵێسای کاتۆلیکی و دامەزراندنی کڵێسا نیشتیمانییەکان و خزمەتکردن بە پرۆسەی سەرهەڵدانی دەوڵەتە سەربەخۆکان، قەوارەیەکی ماددی بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی ئافراند،(٥٣٢) هاوکات بە جەختکردنەوەی ریفۆرمیستەکان لەسەر فێربوونی خوێندنەوە و نووسین و تاکگەرایی و پشتگیریکردنی بلاوبوونەوە و فراوانبوونی زمان و ئەدەبی نەتەوەیی و چاپەمەنی بە نێو بەشی زۆری کۆمەڵدا رۆڵێکی بەرچاویان بینیوە لە بەهێزکردنی هۆشیاری نەتەوەیی، وێڕای ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە لەرێی ئەو رۆڵە گەورەیەوە کە لە گەشەسەندنی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی سیستەمی سەرمایەداری و کۆمەڵگای پیشەسازیدا بینیویەتی هێندەی تر رێخۆشکەری دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی کردووە، بۆیە تیۆریستی بەناوبانگی ناسیۆنالیزم (ئێرنست گێلنەر) دەڵێت: پەیوندی تەواوی هەلۆێستەکانی پرۆتێستانتی و ناسیۆنالیزم تائێستاش پێویستی بە گەڕان و پشکنین هەیە.

بەجۆرە ئەنجامەکانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی بە تەواوی هەموو دیاردە و کۆن و قوژبن و کەلەبەرێکی ژیانی کۆمەڵگای جیهانی کاتۆلیکی لە ئەورووپا گرتەوە و سەرەنجام بوونە رێخۆشکەری سەرهەڵدانی قۆناغێکی نوێی ژیانی کۆمەڵگا کە دواجار ئەم قۆناغە سەرجەم جیهانی گرتەوە.

---

(٥٣١) أندرو فنسنت، نظريات الدولة، ترجمة د. مالك ابو شهيوة و د. محمود خلف، دار الجيل، بيروت، ١٩٩٧، ص٩٨ ؛ ولتر لبمان، المصدر السابق، ص٧٧.

(٥٣٢) عبدالكريم احمد، القومية والمذاهب السياسية، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر، القاهرة، ١٩٧٠، ص٩٩؛ Louis Gottschalk and Donald Lach, Op. Cit., P.191

